# تخريج المناط في حديث ذات أنواط

دیراسەی فەرمموودەکە
لە رووی
سەنەد و مەتن و مانا

نووسینی
عبدالرحمن شارەزووری

١٤٣٩ هـ

# بسم الله الرحمن الرحيم

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِنْ شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ. اَللهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّيْن.

زۆر بە پێویستمان زانی ڕوونکردنەوەیەک بدەین دەربارەی ئەم فەرموودەیەی کە ناسراوە بە (ذات أنواط) بەهۆی ئەم خیلافەی لەسەر فەرموودەکە هەیە لە ڕووی صەحیحی و زەعیفیە، وە هەروەها لە ڕووی لێکدانەوەی مانای فەرموودەکە، کە هەردووک لایەنی خیلافی لەسەرە ئەمە خیلافەش ڕوونە بۆ کەسێک کە ئەم فەرموودەیەی بەرچاو کەوتبێت لە پلەی صەحیحی فەرموودەکەی کۆڵیبێتەوە و بەدوای ماناکەی گەڕابێت، جا بۆی هەیە کەسێک بپرسێ فەرموودەی زۆر هەن کە زانایان خیلافیان هەیە لەسەر صەحیحی و زەعیفیەکەی، وە خیلافیان هەیە لەسەر لێکدانەوەی ماناکەی، بۆچی ئەم فەرموودەیە کتێبێکی تایبەتی لەسەر بنوسرێ لەکاتێکدا زۆرێک فەرموودەی تر هەن بەهەمان شێوە خیلافیان لەسەرە ؟ ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە ئەم فەرموودەیە پەیوەندی بە بابەتێکی زۆر هەستیاری تایبەت بە عەقیدەوە هەیە ئەویش بابەتی تەوحید و شیرکە، چونکە ئێمەی موسڵمان ئێمە دەزانین کە:

(١) لە بابەتی (أصل الدین) کە تەوحید و دژەکەی دەگرێتەوە کە شیرکە، هیچ کەسێک عوزری نەزانینی نیە.

(٢) وە لە بابەتە ئاشکراو دیارەکاندا وەکو واجب بوون و حەڕام بوونی هەندێک شتی ئاشکرا و دیار تەنها دوو جۆر کەس عوزریان بە نەزانین هەیە ئەوانیش: کەسێکی تازە موسڵمان بوو، وە کەسێک کە لە ناوچەیەکی دوورە دەست لە ئیسلام و موسڵماناندا ژیاوە و هەر لەوێدا پێگەیشتووە.

(٣) وه له بابەتەدا شاراوەكاندا كه تەنها زانايان و كەسانى فێرخواز بەڵگەكانيان دەزانن و تێيدەگەن، زۆربەى خەڵكى عوزرى هەيه به نەزانين لەم بابەتانەدا وەكو هەندێک لايەنى (الأسماء والصفات – القدر – هتد ...) وەكو ئەو پياوەى كه ووتى لاشەكەم بسوتێنن دواى مردنم.

وه بۆ تێگەيشتنى زياترى ئەم بابەته و بەڵگەكانى بگەڕێنەوه سەر كتێبى (حكم تكفير المعين والفرق بين قيام الحجة وفهم الحجة)ى (شێخ ئيسحاق نەوەى شێخ محمد بن عبد الوهاب) كه برايەكيش خوا لێى قبوڵ بكات وەرى گێڕاوەته سەر زمانى كوردى بۆ ئەوانەى كه عەرەبى نازانن.

سەرەڕاى ئەمانه كەچى ئەوەتا لەم فەرموودەيەدا هاوەڵان داوايان له پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" كرد دارێكيان بۆ دابنێت وەكو كافران چەكەكانيان پێيەوه هەڵبواسن بۆ تەبەڕڕوک پێكردن، كەچى پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" تەكفيرى نەكردن بەم داوايەيان چونكه تازه موسڵمان ببوون هەروەک له فەرموودەكەدا هاتووه، ئێمەش فێر بووين و تێيگەيشتووين له ئايەتەكانى الله تعالى و فەرموودەكانى پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" وه ووتەى هاوەڵان و تابعين و زانايانى دواترى ئەم ئوممەته كه هيچ كەسێک عوزرى نيه به جەهل له بابەتى (أصل الدين) كه تەوحيده، بەڵام بەهۆى ئەم فەرموودەيه دەبێت بڵێين ئێمه چەندەها ساڵه به هەڵه لەم بەڵگانه تێگەيشتووين له بابەتى (أصل الدين)يش عوزر به جەهل هەيه، وه زانايانيش به هەڵه تێگەيشتوون لەم بابەتەدا چونكه ئەوەتا بەگوێرەى فەرموودەكه عوزر به جەهل له شيركيشدا هەيه!!! (معاذ الله) كەسى عاقڵ قسەى ئاوا بكات ئەم عەقيده پتەو و پڕ له بەڵگەيه ڕەت بكاتەوه و قسەى زانايانى ئوممەت به هەڵه بخاتەوه يان گومانى تێدا دروست بكات بەهۆى ئەم فەرموودەيه، جا لێرەدا يان دەبێت بڵێين زانايانى ئوممەت هەڵه بوونه كه وتوويانه عوزر به جەهل نيه له شيركدا !!! يان دەبێت ئەم فەرموودەيه زەعيف بێت يان ئەگەر بڵێين صەحيحيشه ئەوا ئەم مانايه نادات كه هەندێک خەڵک تێيگەيشتووه بەتايبەتى مورجيئه و جەهميەكان بەڵكو مانايەكى ترى هەيه جگه

لەو مانایەی کە ئەوان تێیگەیشتوون، چونکە ئەوان ئەم فەرموودەیە دەکەن بە بەڵگە بۆ هەبوونی عوزر بە جەهل لە شیرکدا.
جا بۆی هەیە ئەوان بڵێن چونکە فەرموودەکە دژی تێگەیشتنی ئێوەیە دەتانەوێت فەرموودەکە بە زۆر بە زەعیف دابنێن کەچی (الترمذي و الألباني) بە صەحیحیان داناوە، یان دەتانەوێت بە زۆر مانای فەرموودەکە بگۆڕن و تەئویلی بکەن بۆ مانایەکی تر تاوەکو ڕزگارتان بێت لەم بەڵگەیە و بەردەوام بن لەسەر قسەی خۆتان کە دەڵێن عوزر بە جەهل نیە لە (أصل الدین)دا.
ئێمەش دەڵێین: (معاذ الله) فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" بە زەعیف دابنێین و ڕەتی بکەینەوە تەنها لەبەر هەوا و ئارەزوومان، یان مانای ڕاستەقینەی فەرموودەیەکی صەحیح بگۆڕین و تەئویلی بکەین بۆ مانایەکی باطل بەهۆی هەوا و ئارەزوومان، بەڵکو دەبێت ڕاستیەکان وەکو خۆی باس بکەین هەم لەڕووی سەنەدی فەرموودەکەوە، وە هەم لەڕووی تێگەیشتنی زانایانی ئوممەت بۆ مانای فەرموودەکە.

جا إن شاء الله تعالی، لەم کتێبەدا بە تێر و تەسەلی باسی فەرموودەکە دەکەین لە هەردوو لایەنی سەنەد و ماناوە، بۆ ئەوەی دڵی موەحیدان ئۆخەی بێت بەرامبەر گومانەکانی گومانکاران، وە ببێتە لابەری گومانی دڵ نەخۆشان و هیدایەت دانیان کە دڵیان بەم فەرموودەیە خۆشکردووە، هەرچەندە ئەوەی یەکەمیان بە ئاسان دەزانم و ئەوەی دووەمیان بە زەحمەت، بەڵام هیچ شتێک لای ئەو زاتە زەحمەت نیە کە دڵەکان بە ویستی خۆی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکات، یا مقلب القلوب ثبت قلبنا علی دینك.

# دەقی فەرموودەکە:

**عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي (رضي الله عنه) :**

**خرجنا مع رسول الله "صلى الله عليه وسلم" إلى حنين، ونحن حديثو عهد بكفر، وكانوا أسلموا يوم الفتح، قال: فمررنا بشجرة فقلنا: يا رسول الله اجعل لنا ذات أنواط كما لهم ذات أنواط، وكان للكفار سدرة يعكفون حولها ويعلقون بها أسلحتهم، يدعونها ذات أنواط، فلما قلنا ذلك للنبي صلى الله عليه وسلم، قال: الله أكبر، قلتم والذي نفسي بيده كما قالت بنو إسرائيل لموسى: اجعل لنا إلها كما لهم آلهة، قال: إنكم قوم تجهلون، لتركبن سنن من كان قبلكم.**

---

هاوەڵی بەڕێز (أبو واقد الليثي) "رضي الله عنه" دەگێڕێتەوە: لەگەڵ پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" بەرەو حونەین دەرچووین، وە ئێمە تازە موسڵمان ببوین (لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا موسڵمان ببون) جا تێپەڕین بەلای دارێکدا ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا دارێکمان بۆ دابنێ شتی پێهەڵواسین (بۆ تەبەڕروک) وەکو چۆن کافران دارێکیان هەیە شتی پێهەڵدەواسن، کافرەکان دارێکیان هەبوو ئیعتیکافیان دەکرد بە دەوریدا و چەکەکانیان پێوە هەڵدەواسی، پێیان دەووت: ذات أنواط (واتا ئەو دارەی کە شتی پێهەڵدەواسرێ) جا کاتێک ئەمەمان بە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" ووت، فەرمووی: الله أكبر ، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو شتەتان ووت کە نەوەی ئیسرائیل بە موسایان ووت: موسا خوایەکمان بۆ دابنێ وەکو چۆن ئەم قەومە خوایان هەیە، موساش ووتی: بەڕاستی ئێوە قەومێکی جاهیلن، پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" فەرمووی: شوێنی ڕێبازی ئوممەتانی پێش خۆتان دەکەون.

زۆرێک لە زانایانی فەرموودە ئەم فەرموودەیان ڕیوایەتکردووە، هەموویان بەیەک مانا ڕیوایەتیان کردووە تەنها ئەوە نەبێت لە ڕیوایەتی هەندێکیان چەند ووشەیەکیان زیاترە، وە لە ڕیوایەتی هەندێکیان چەند ووشەیەک کەمترە، بۆیە منیش ئەم ڕیوایەتەم هەڵبژاردووە چونکە هەموو ووشەکانی تێدایە، وەکو تازە موسڵمان بوونیان، وە موسڵمان بوونیان لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا، کە ئەم دوو ڕستەیە لە هەندێک ڕیوایەتی تردا نین، تەنها ئەوە نەبێت لە هەندێک ڕیوایەتدا هاتووە کە پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" فەرموویەتی (سبحان الله لەبری الله أکبر).

**ئەمەی سەرەوە تەنها دەقی فەرموودەکە و ماناکەی بوو بەشێوەیەکی ڕووکەشی، بۆ ئەوەی سەرەتا بزانن فەرموودەکە باسی چی دەکات.**
**ئێستاش دێینە سەر شیکردنەوەی سەنەد و مەتنی فەرموودەکە بە تێر و تەسەلی، وە تێگەیشتنی ووردی زانایان لە ماناکەی، کە بە دوو بەشی جیا هەردووکیان باس دەکەین إن شاء الله تعالی.**

# بەشی یەکەم

# شیکردنەوەی سەنەد و مەتنی فەرموودەکە

## سەرچاوەکانی فەرموودەکە:

**1. رواه الترمذي في سننه (بەژمارە 2180)**

**باب ما جاء لتركبن سنن من كان قبلكم:**

حدثنا سعيد بن عبد الرحمن المخزومي حدثنا سفيان (بن عيينة) عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

(قال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح، وأبو واقد الليثي اسمه الحارث بن عوف، وفي الباب عن أبي سعيد وأبي هريرة).

**2. رواه أحمد في مسنده (بەژمارە 21390 - 21393)**

**21390-** حدثنا حجاج حدثنا ليث يعني ابن سعد حدثني عقيل بن خالد عن ابن شهاب (الزهري) **عن سنان بن أبي سنان الدؤلي ثم الجندعي عن أبي واقد الليثي** .....

**21393-** حدثنا عبد الرزاق أنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

**3. رواه الحميدي في مسنده (بەژمارە 871)**

حدثنا سفيان (بن عيينة) قال حدثنا الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

**4. رواه عبد الرزاق في تفسيره (بەژمارە 931)**

عن معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

### 5. رواه عبد الرزاق في مصنفه (بەژماره 20763)

أخبرنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

### 6. رواه الطبراني في المعجم الكبير (ژماره 3290-3291-3292-3293-3294)

**3290-** حدثنا إسحاق بن إبراهيم الدبري أخبرنا عبد الرزاق أخبرنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي**.....

**3291-** حدثنا علي بن عبد العزيز حدثنا القعنبي عن مالك عن ابن شهاب (الزهري) **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

**3292-** حدثنا بشر بن موسى حدثنا الحميدي حدثنا سفيان (بن عيينة) حدثنا الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

**3293-** حدثنا المقدام بن داود حدثنا أسد بن موسى حدثنا يحيى بن زكريا بن أبي زائدة حدثنا بن إسحاق حدثني الزهري **عن سنان بن أبي سنان الليثي ثم الجندعي عن أبي واقد الليثي** .....

**3294-** حدثنا حسين بن إسحاق التستري حدثنا يحيى الحماني حدثنا إبراهيم بن سعد عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

### 7. رواه ابن أبي عاصم في السنة (بەژماره 76)

حدثنا يعقوب بن حميد حدثنا إبراهيم بن سعد عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان أنه سمع أبا واقد الليثي** ......

### 8. رواه النسائي في سنن الكبرى (بەژماره 11121)

أخبرنا محمد بن رافع حدثنا عبد الرزاق أخبرنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

**9. رواه أبو داود الطيالسي في مسنده (بەژمارە 1443)**

حدثنا يونس قال حدثنا أبو داود قال حدثنا إبراهيم بن سعد قال حدثنا الزهري **عن سنان بن أبي سنان الدؤلي عن أبي واقد الليثي** .....

**10. رواه الطبري في تفسيره (بەژمارە 15055-15056-15057-15058)**

**15055-** حدثنا محمد بن عبد الأعلى قال حدثنا محمد بن ثور عن معمر عن الزهري **أن أبا واقد الليثي** .....

**15056-** حدثنا الحسن بن يحيى قال أخبرنا عبد الرزاق قال أخبرنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

**15057-** حدثني المثنى قال حدثنا الحجاج قال حدثنا حماد عن محمد بن إسحاق عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

**15058-** حدثني المثنى قال حدثنا ابن صالح قال حدثني الليث قال حدثني عقيل عن ابن شهاب (الزهري) قال **أخبرني سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

**11. رواه المروزي في السنة (بەژمارە 37-38-39-40)**

**37-** حدثنا أبو قدامة عبيد الله بن سعيد حدثنا سفيان (بن عيينة) عن الزهري **عن سنان ابن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

**38-** حدثنا إسحاق بن إبراهيم حدثنا عبد الرزاق حدثنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

**39-** حدثنا محمد بن يحي حدثنا عبد الله بن الليثي بن عبيد الضبعي عن جويرية عن مالك عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي حدثه عن أبي واقد الليثي** .....

**40-** حدثنا محمد بن يحي حدثنا أبو صالح حدثني الليث حدثني عقيل عن ابن شهاب (الزهري) **أخبرني ابن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

### 12. رواه ابن بطة في الإبانة الكبرى (بەژمارە 710)

حدثنا أبو الحسن أحمد بن القاسم بن الريان البستي قال حدثنا إسحاق بن إبراهيم أبو يعقوب الدبري قال حدثنا عبد الرزاق قال أخبرنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلمي عن أبي واقد الليثي** .....

### 13. رواه أبو يعلى الموصلي في مسنده (بەژمارە 1441)

حدثنا أبو بكر بن أبي شيبة حدثنا سفيان بن عيينة عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

### 14. رواه أبو نعيم في معرفة الصحابة (بەژمارە 1886)

1-حدثنا سليمان بن أحمد حدثنا إسحاق بن إبراهيم أنبأنا عبد الرزاق أنبأنا معمر. 2-وحدثنا محمد بن أحمد بن الحسن حدثنا بشر بن موسى حدثنا الحميدي حدثنا سفيان. 3-وحدثنا أبو بكر بن خلاد قال حدثنا محمد بن غالب بن حرب حدثنا القعنبي عن مالك. 4-وحدثنا عبد الله بن جعفر حدثنا يونس بن حبيب حدثنا أبو داود حدثنا إبراهيم بن سعد. 5-وحدثنا محمد بن أحمد بن حمدان حدثنا الحسن بن سفيان حدثنا طالوت بن عباد حدثنا حماد بن سلمة حدثنا محمد بن إسحاق. كلهم قال عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

### 15. رواه الأزرقي في أخبار مكة (بەژمارە 161)

حدثنا أبو الوليد قال حدثني جدي عن محمد بن إدريس عن محمد بن عمر الواقدي عن معمر بن راشد البصري عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

### 16. رواه ابن أبي حاتم في تفسيره (بەژمارە 8906)

حدثنا هارون بن إسحاق الهمداني ومحمد بن الوزير الواسطي قالا حدثنا سفيان (بن عيينة) عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

### 17. رواه البيهقي في دلائل النبوة (بەژمارە 1881-1882)

**1881-** أخبرنا أبو عبد الله الحافظ وأبو بكر القاضي قالا حدثنا أبو العباس محمد بن يعقوب قال حدثنا أحمد بن عبد الجبار قال حدثنا يونس عن ابن إسحاق عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

**1882-** حدثنا أبو محمد عبد الله بن يوسف الأصبهاني إملاء قال أنبأنا أبو سعيد أحمد بن محمد بن زياد البصري بمكة قال حدثنا الحسن بن محمد الزعفراني قال حدثنا سفيان بن عيينة عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

### 18. رواه البيهقي في معرفة السنن والآثار (بەژمارە 329)

أخبرنا أبو إسحاق (إبراهيم بن محمد الفقيه) قال أخبرنا أبو النضر الاسفرائيني قال أخبرنا أبو جعفر بن سلامة قال حدثنا المزني قال حدثنا الشافعي قال سمعت سفيان (بن عيينة) يحدث عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

### 19.رواه اللالكائي في شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة(ژمارە 205)

أخبرنا أحمد بن عبيد قال أخبرنا علي بن عبد الله بن مبشر قال حدثنا محمد بن الوزير بن قيس قال حدثنا سفيان (بن عيينة) عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

### 20. رواه البغوي في تفسيره (سورەتی الأعراف : ئايەتی 140)

أخبرنا أبو سعيد عبد الله بن أحمد الطاهري أخبرنا جدي أبو سهل عبد الصمد بن عبد الرحمن البزار أخبرنا أبو بكر محمد بن زكريا العذافري أخبرنا إسحاق بن إبراهيم الدبري أخبرنا عبد الرزاق أخبرنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** .....

### 21. رواه ابن أبي شيبة في مصنفه (بەژمارە 38391)

حدثنا (سفيان) ابن عيينة عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي** .....

### 22. رواه ابن حبان في صحيحه (بەژمارە 6702)

أخبرنا محمد بن الحسن بن قتيبة حدثنا حرملة قال حدثنا ابن وهب قال أخبرنا يونس عن ابن شهاب (الزهري) **أن سنان بن أبي سنان الدؤلي (وهم حلفاء بني الديل) أخبره أنه سمع أبا واقد الليثي** .....

### 23. رواه الواقدي في المغازي (بەرگی 3 - لاپەڕە 890)

حدثنا معمر عن الزهري **عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي** (وهو الحارث بن مالك) قال .....

### 24. رواه ابن هشام في السيرة النبوية (بەرگی 4 - لاپەڕە 85)

قال ابن إسحاق وحدثني ابن شهاب الزهري عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي أن الحارث بن مالك قال .....

**تێبینی:** ڕیوایەتی ابن هشام وا نیشان دەدات کە (أبي واقد الليثي و الحارث بن مالك) دوو کەسی جیابن، بەڵام أبو واقد الليثي خۆی ناوی الحارث بن مالك ە، هەروەک لە ڕیوایەتی الواقدي دا هاتووە، وە دواتر دێینە سەر ناوی تەواوی أبو واقد الليثي.

ئەمە کۆی ئەم سەرچاوانەن کە تیایدا ئەم فەرموودەیە هاتووە، کە ژمارەیان **( 24)** کتێب و **(40)** سەنەدە، هەمووی لە ڕێگای (سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي) جگە لەمانەش گەر لە سەرچاوەی تریشدا هەبێ (کە باوەڕ ناکەم هەبێ) هیچ لە بابەتە ناگۆڕێت، چونکە هەموو سەنەدەکان بە (سنان بن أبي سنان و أبي واقد الليثي) تێدەپەڕن، تەنها (ابن أبي حاتم) نەبێ لە تەفسیرەکەیدا بە دوو سەنەدی جیاواز ئەم فەرموودەیەی هێناوە، وە (الطبراني)ش لە (المعجم الكبير)دا بە دوو سەنەدی جیاواز

ئەم فەرموودەیەی هێناوە، سەنەدی یەکەمی (ابن أبي حاتم و الطبراني) هەر بە (سنان بن أبي سنان و أبي واقد الليثي) تێدەپەڕێ هەروەک هێناومانە لە سەرەوەدا.

وە سەنەدی دووەمی (ابن أبي حاتم و الطبراني) جیایە لە هەموو ئەم سەنەدانەی سەرەوە چونکە سەنەدەکە بە کەسانی جیا لە (سنان بن أبي سنان و أبو واقد الليثي) تێدەپەڕێ، بەڵام سەنەدی هەردووکیان وەکو یەکە کە ئەویش بریتیە لەم سەنەدە:

**1. قال إبن أبي حاتم في تفسيره (بەژمارە 8910)**

حدثنا أبي حدثنا إبراهيم بن المنذر حدثنا محمد بن إسماعيل بن أبي فديك **عن كثير بن عبد الله بن عوف عن أبيه عن جده** .....

**2. قال الطبراني في المعجم الكبير (بەژمارە 27) بەرگی 17 - لاپەڕە 21**

حدثنا مسعدة بن سعد العطار حدثنا إبراهيم من المنذر حدثنا ابن أبي فديك **عن كثير بن عبد الله المزني عن أبيه عن جده** .....

هەروەک دیارە ئەم دوو سەنەدەی (ابن أبي حاتم و الطبراني) جیاوازە لەم سەنەدەکانی پێشوو، لەبڕی (سنان بن أبي سنان و أبي واقد الليثي) بە (كثير و عبدالله)ی باوکی تێدەپەڕێ.

(الواقدي)یش لە کتێبی (المغازي) بە دوو سەنەدی جیاواز ئەم فەرموودەیەی هێناوە، سەنەدی یەکەم هێناومانە لە سەرەوەدا کە هەر بە (سنان بن أبي سنان و أبي واقد الليثي) تێدەپەڕێ، بەڵام سەنەدی دووەمی جیایە لە هەموو ئەم سەنەدانەی پێشوو کە هێناومانە، (الأزرقي)یش لە کتێبی (أخبار مكة) بە دوو سەنەدی جیا ئەم فەرموودەیەی هێناوە، وە هەردووک سەنەدەکەی (الأزرقي) هەمان دوو سەنەدەکەی (الواقدي)ە، سەنەدی یەکەمی هەردووکیان لەسەرەوەدا هاتووە کە هەر بە (سنان بن أبي سنان و أبي واقد الليثي) تێدەپەڕێ، وە سەنەدی دووەمی هەردووکیان بریتیە لەم سەنەدە:

**1. رواه الواقدي في المغازي (بەرگی 3 - لاپەڕە 891)**

حدثني **ابن أبي حبيبة عن داود بن الحصين عن عكرمة** عن ابن عباس .....

## 2. رواه الأزرقي في أخبار مكة (بەژمارە 162)

حدثنا أبو الوليد قال حدثني جدي عن محمد بن إدريس **عن الواقدي قال أخبرني ابن أبي حبيبة عن داود بن الحصين عن عكرمة** عن ابن عباس .....

هەروەک دیارە ئەم سەنەدە جیاوازە لە هەموو سەنەدەکانی پێشوو کە بە (ابن أبي حبيبة و داود بن الحصين و عكرمة) تێدەپەڕێ.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم فەرموودەیە لەم سێ سەنەدە زیاتری نیە، **سەنەدی یەکەم:** کە بە **(سنان بن أبي سنان و أبو واقد الليثي)** تێدەپەڕێ، کە کۆمەڵێکی زۆر ڕیوایەتیان کردووە وەکو لە سەرەوەدا هاتووە.

**سەنەدی دووەم:** کە بە **(كثير و عبد الله)**ی باوکی تێدەپەڕێ، کە (إبن أبي حاتم) و (الطبراني) بە تەنها ئەم سەنەدەیان هێناوە.

**سەنەدی سێیەم:** کە بە **(ابن أبي حبيبة و داود بن الحصين و عكرمة)** تێدەپەڕێ، کە (الواقدي و الأزرقي) بە تەنها ئەم سەنەدەیان هێناوە.

**تێبینی:** بێگومان ژمارەی ئەم فەرموودەیە لەم کتێبەکانەدا کە هاتووە بەگوێرەی چاپخانەکان و ساڵی چاپەکانی کتێبەکان ژمارەی فەرموودەکە دەگۆڕێت، بۆیەش ژمارەی فەرموودەکانم نوسیوە لەبڕی ژمارەی لاپەڕەکان و بەرگەکان، چونکە ژمارەی لاپەڕە و بەرگەکان لە چاپێکەوە بۆ چاپێکی تر دەگۆڕێت، ئەگەرچی ژمارەی فەرموودەکانیش دەگۆڕێن بەڵام هێشتا دۆزینەوەی ئاسانترە وەک لە دۆزینەوەی ژمارەی لاپەڕە و بەرگەکان.

# شیکردنەوەی سەنەدی یەکەم

## (عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي)

بۆ حوکمدان لەسەر هەر فەرموودەیەک پێویستە پێنج خاڵ جێبەجێ بکەین، تاوەکو پلەی صەحیحی فەرموودەکە بزانین، ئەوانیش بریتین لەمانە:

**یەکەم: کۆکردنەوەی ڕێگاکانی - سەنەدەکانی - فەرموودەکە (جمع الطرق).**

وەک دەبینن هەموو ڕێگاکانی (سەنەدەکانی) فەرموودەکەمان کۆکردۆتەوە.

**دووەم: دەستنیشان کردنی (مدار الحديث) واتا فەرموودەکە بە دەوری کام ڕاوی دەخولێتەوە، ئەو ڕاویەی لە هەموو سەنەدەکاندا هاتووە.**

وەک دەبینن مەداری فەرموودەکەمان دەست نیشان کردووە لە سەنەدی یەکەمدا، کە بریتیە لە **(سنان بن أبي سنان).**

**سێیەم: ئایا ئەوانەی فەرموودەکەیان ڕیوایەتکردووە خیلافیان لەسەر مەداری فەرموودەکە، واتا هەموو بەیەک شێوە ڕیوایەتیان کردووە بەبێ جیاوازی ؟**

هەروەک دەبینن هەموو ئەوانەی فەرموودەکانیان ڕیوایەتکردووە دەگەڕێنەوە سەر تابعی (سنان بن أبي سنان) ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ هاوەڵی بەڕێز (أبو واقد الليثي) لە هیچ سەنەدێکدا خیلافیان نیە دەربارەی مەدارەکە هەموویان وەکو یەک ڕیوایەتکردووە، تەنها دوو ڕیوایەت نەبێ جیاوازن لەوانی تر کە تیایدا (سنان بن أبي سنان) گوێی لە (أبو واقد الليثي) بووە، بەڵام لە هەموو ڕیوایەتەکانی تردا (سنان بن أبي سنان) بەشێوەی (عنعنة) ڕیوایەتەکە دەگێڕێتەوە لە (أبي واقد الليثي)، واتا دەڵێ: عن أبي واقد الليثي، بەڵام لە ڕیوایەتی (ابن أبي عاصم و ابن حبان)دا بە شێوەی گوێ بیستن هاتووە کە دەڵێ: سمع أبا واقد الليثي، ئەم دوو دەستەواژەیەش لە زانستی فەرموودەدا جیاوازن و هەر یەکەیان حوکمێکی جیای هەیە.

**چوارەم: ئەگەر خیلاف هەبوو لەنێوان سەنەدەکاندا دەربارەی مەداری فەرموودەکە، ئەوا دەبێت تەرجیح بکەین لەنێوان خیلافەکاندا و سەنەدە بەهێز و ڕاستەقینەکە هەڵبژێرین.**

هەروەک دەبینن هیچ خیلافێک نیە لەسەر مەداری فەرموودەکە، هەموو سەنەدەکان وەکو یەکن، تەنها ئەوە نەبێت لە دوو ڕیوایەتەکەی (ابن أبي عاصم و ابن حبان) بە شێوەی (سمع) هاتووە لەبڕی (عن)، جا پێویستە لێرەدا تەرجیح بکەین لەنێوان ئەم دوو شێوەیەدا کە کامەیان ڕاستە، چونکە هەر یەکەیان حوکمێکی جیای هەیە لە زانستی دەستەواژەی فەرموودەدا (علم مصطلح الحديث).

ئەم دوو سەنەدەی کە بەشێوەی (سمع) هاتووە:

**ڕیوایەتی ابن أبي عاصم:** حدثنا يعقوب بن حميد حدثنا إبراهيم بن سعد عن الزهري عن سنان بن أبي سنان أنه سمع أبا واقد الليثي ......

**ڕیوایەتی ابن حبان:** أخبرنا محمد بن الحسن بن قتيبة حدثنا حرملة قال حدثنا ابن وهب قال أخبرنا يونس عن ابن شهاب (الزهري) أن سنان بن أبي سنان الدؤلي (وهم حلفاء بني الديل) أخبره أنه سمع أبا واقد الليثي ......

سەرەتا باسی سەنەدەکەی (ابن أبي عاصم) دەکەین: هەروەک دەبینین إبراهيم بن سعد قوتابی ئیمام الزهري لە الزهري ڕیوایەتی کردووە ئەویش لە سنان ەوە کە گوێ بیستی أبي واقد الليثي بووە، واتا سنان سمع من أبي واقد الليثي.

بەڵام (أبو داود الطيالسي و أبو نعيم و الطبراني) هەرسێکیان بە هەمان شێوە لە إبراهيم بن سعد عن الزهري عن سنان عن أبي واقد الليثي ڕیوایەت دەکەن بەشێوەی (عنعنة) واتا لەفزی عن نەوەک بەشێوەی (السماع) واتا لەفزی سمع.

**ڕیوایەتی أبو داود الطيالسي:** حدثنا يونس قال حدثنا أبو داود قال حدثنا إبراهيم بن سعد قال حدثنا الزهري عن سنان بن أبي سنان الدؤلي عن أبي واقد الليثي .....

**ڕیوایەتی أبو نعيم:** وحدثنا عبد الله بن جعفر حدثنا يونس بن حبيب حدثنا أبو داود حدثنا إبراهيم بن سعد عن الزهري عن سنان بن أبي سنان الديلي عن أبي واقد الليثي .....

**ڕیوایەتی الطبراني: 3294-** حدثنا حسين بن إسحاق التستري حدثنا يحيى الحماني حدثنا إبراهيم بن سعد عن الزهري عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي .....

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ لەکۆی چوار ڕیوایەتی إبراهيم بن سعد، سێ دانەیان بە (عن) هاتووە تەنها یەک دانەیان بە (سمع) هاتووە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ڕیوایەتی (عن) زیاترە و بەهێزترە لە ڕیوایەتی (سمع)، وە هاتنی ووشەی (سمع) لە ڕیوایەتی (ابن أبي عاصم) بۆ هەڵەی یەکێک لە ڕاوییەکان دەگەڕێتەوە یان هەڵەی کۆپیکەران (النساخ)ی کتێبی (السنة)ی ابن أبي عاصم.

با بێینە سەر سەنەدەکەی (ابن حبان) : هەروەک دیارە یونس قوتابی ئیمام الزهري ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەتکردووە لە ئیمام الزهري ئەویش لە سنان ەوە کە گوێی لە أبي واقد الليثي بووە ......

ئیمام الزهري بەهۆی ئەوەی کۆمەڵێک قوتابی ئێجگار زۆری هەبووە، وە خۆشی ڕیوایەتی ئێجگار زۆرە، زانایانی فەرموودەناس قوتابیەکانی ئیمامی الزهري یان کردووە بە پێنج چین، چینی یەکەم ئەم قوتابیانە دەگرێتەوە کە هەمیشە لەگەڵ ئیمام الزهري دابوون و لێی دانەبڕاون، وە توانای لەبەرکردنیان زۆر بەهێزە، ئەوانیش بریتین لە:

مالك و سفيان بن عيينة و معمر و عقيل و شعيب و يونس ... هی تر، بەڵام ئەم ناوانە زۆرتر دیار و بڵاوترن لەوانی تر، وە لەنێوان ئەم قوتابیانەی چینی یەکەم زانایان باشترین قوتابی ئیمام الزهري یان هەڵبژاردووە و پلە بەندیان بۆیان کردووە، بەم شێوەیە: مالك پلەی یەکەم، سفيان بن عيينة پلەی دووەم، معمر پلەی سێیەم، عقيل و شعيب و يونس پلەیان لە یەکتر نزیکە دەتوانین بڵێین ئەم سێیانە لە پلەی چوارەم دێن، سودی ئەم پلە بەندیەش ئەوەیە گەر فەرموودەیەک الزهري ڕیوایەتی بکات، وە هەر یەکێک لەم قوتابیانە بەجۆرێکی جیاواز لە الزهري ڕیوایەتی بکەن، ئەوا ئەوکات دەتوانین ڕیوایەتە ڕاستەکە دەست نیشان بکەین بەهۆی پلەکانیانەوە، بۆ نموونە: گەر مالك بەجۆرێک ڕیوایەت بکات و سفيان بن عيينة بەجۆرێکی تر ئەوا ڕیوایەتی مالك ڕاسترە چونکە پلەی یەکەمی هەیە لە قوتابیەکانی الزهري، وە ئەگەر سفيان بە جۆرێک ڕیوایەتی بکات، شعيب یان عقيل یان يونس بە جۆرێکی تر

ڕیوایەتی بکەن، ئەوا ڕیوایەتەکەی سفیان ڕاستره بەهۆی بەرزی پلەکەی، وە ئەگەر مالك و سفیان و معمر بەشێوەیەک ڕیوایەتی بکەن، وە شعیب و عقیل و یونس بەشێوەیەکی تر ڕیوایەتی بکەن، ئەوا بێ گومان ڕیوایەتەکەی مالك و سفیان و معمر ڕاستره، لەم ڕیوایەتەی (ابن حبان)دا دەبینین یونس له الزهري ڕیوایەتی کردووه ئەویش له سنان ەوە کە گوێ بیستی أبي واقد الليثي بووه ...... واتا بە لەفزی (سمع) کەچی دەبینین له کۆمەڵێک ڕیوایەتی تردا کە هێناومانه له سەرەوەدا مالك و سفیان و معمر و عقیل هەر چواریان له الزهري ڕیوایەتیان کردووه ئەویش له سنان ەوە ئەویش له أبي واقد الليثي ..... واتا بە لەفزی (عن)، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ ڕیوایەتی ئەم چوارە بێ گومان بەهێزترە له ڕیوایەتی یونس، کەواتە لەفزی (عن) ڕاستره له لەفزی (سمع) واتا ڕیوایەتەکە بەشێوەی (عنعنة) ڕاستە نەوەک بەشێوەی (السماع).

وە بەهەمان شێوە إبراهیم بن سعد پێچەوانەی مالك و سفیان و معمر و عقیل ی کردووه کە بە (سمع) ڕیوایەتی کردووە هەروەک لەلای (ابن أبي عاصم)دا هاتووه، وە بەهەمان شێوە هەر خۆی بە (عن) ڕیوایەتی کردووه له سێ ڕیوایەتی تردا هەروەک تۆزێک پێش ئێستا باسمان کرد.
جا کاتێک ڕیوایەتی مالك و سفیان و معمر بەڕاستر دابنرێ له ڕیوایەتی یونس، ئەوا بێگومان ڕاستریشه له ڕیوایەتی إبراهیم بن سعد، گەرچی یونس و إبراهیم بن سعد له باشترین قوتابیەکانی ئیمام (الزهري)ن بەڵام پلەیان ناگاتە مالك و سفیان و معمر.
بەڵگەش بۆ ئەمە: له کتێبی (شرح علل ابن أبي حاتم)دا فەرموودەیەک هاتووه بەم سەنەدەوە: مالك عن الزهري عن عروة بن الزبير عن عائشة.
وە هەمان فەرموودە هاتووه بە سەنەدێکی تر:
إبراهيم بن سعد قال سمعت الزهري يحدث عن القاسم بن محمد عن عائشة.
واتا خیلاف لەنێوان ڕیوایەتی مالك و إبراهيم بن سعد لەوە دایە کە مالك ناوی عروة بن الزبیر ی هێناوه، بەڵام إبراهيم بن سعد ناوی القاسم بن محمد ی هێناوه.
ابن أبي حاتم دەڵێ: پرسیار له (أبو زرعة الرازي)کرا دەربارەی ئەم فەرموودەیه، ووترا: مالك و سفيان بن عيينة و جگە لەوانیش ڕیوایەتیان کردووە عن الزهري عن عروة عن عائشة، وە إبراهيم بن سعد ڕیوایەتی کردووه عن الزهري عن القاسم بن محمد

عن عائشة، (أبو زرعة) لە وەڵامدا ووتی: فەرمووده ڕاستەکە لەلای من فەرموودەی (عروة)یە. واتا (أبو زرعة) ڕیوایەتی مالك و سفیان بەڕاستر دانا لە ڕیوایەتی إبراهیم بن سعد.

وە (ابن عدي) لە کتێبی (الكامل في الضعفاء) دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێ: إبراهيم بن سعد ڕیوایەتی کردووە عن الزهري عن القاسم بن محمد عن عائشة، وە هاوەڵانی الزهري (واتا مالك و سفيان بن عيينة) پێچەوانەی إبراهيم بن سعد یان کردووە، ڕیوایەتیان کردووە عن الزهري عن عروة عن عائشة.

وە (الدارقطني) لە کتێبی (العلل) دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێ: إبراهيم بن سعد پێچەوانەی ئەوانی کردووە (واتا مالك و سفيان بن عيينة) ڕیوایەتی کردووە عن الزهري عن القاسم بن محمد عن عائشة، وە قسەی ئەوانە ڕاستە کە دەڵێن: عن عروة. (واتا ئەو ڕیوایەتە ڕاستە کە عروة ی تێدایە نەوەک ئەو ڕیوایەتەی کە القاسم بن محمد ی تێدایە).

گەر تەنازولیش بکەین و وا دابنێین کە (سمع) ڕاستە هێشتا مانای صەحیحی فەرموودەکە ناگەیەنێت چونکە فلتەری تر ماون کە فەرموودەکەی پێدا تێپەڕێ بە سەنەد و مەتنەوە.

**پێنجەم: جێبەجێ کردنی مەرجەکانی صەحیح بوون لەسەر فەرموودەکەدا لەڕووی سەنەد و مەتنەوە، کە ئەویش بریتیە لە پێنج مەرج، واتا دەبێت هەر فەرموودەیەک پێنج مەرجی تێدا بێتەدی تاوەکو بڵێین صەحیحە، یەکێکیانی لێ نێتە دی دەبێتە زەعیف.**

**مەرجی یەکەم:** إتصال السند (بەیەک گەیشتنی ڕاوییەکانی ناو سەنەدەکە بەبێ هەبوونی پچڕان لە نێواندا) واتا لە یەک سەردەمدا ژیابن و فەرموودەکەیان لە یەکترەوە بیستبێ.

ئێمەش ئەم مەرجە لەسەر سەنەدەکە جێبەجێ دەکەین بزانین تیایدایە یان نا، بە نموونە سەنەدی (عبد الرزاق) وەردەگرین کە کورترین و ئاسانترین سەنەدە.

**(عبد الرزاق عن معمر عن الزهري عن سنان بن أبي سنان عن أبي واقد الليثي)**

ئایا عبد الرزاق به معمر گەیشتووە ؟ بەڵێ قوتابی هەرە دیاری معمر بووە.

ئایا معمر به الزهري گەیشتووە ؟ بەڵێ قوتابی دیاری الزهري بووە.

ئایا الزهري به سنان بن أبي سنان گەیشتووە ؟ بەڵێ.

ئایا سنان بن أبي سنان به أبي واقد الليثي گەیشتووە و گوێ بیستی بووە ؟ نەخێر.

**بەڵگە:** ئیمامی البخاري لە کتێبی (التاريخ الكبير)دا کە تایبەتە بە ڕاویەکان، گەرچی زیاتر ئیمامی البخاري دەیەوێ لەم کتێبەدا عیللەتی فەرموودەکانی ئەو ڕاویە دەربخات کە باسی ژیانیان دەکات، بۆ نمونە: دەربارەی ژیانی (سنان بن أبي سنان) دەڵێ: فەرموودەی بیستووە لە (أبو هريرة و جابر و حسين بن علي) واتا ئەوەی لەلای ئیمام البخاري جێگیربووە ئەوەیە کە (سنان) فەرموودەی لەم سێ هاوەڵە بیستووە،ئینجا بوخاری ئەم فەرموودەیە دەهێنێتەوە و دەڵێ: قال لنا أبو صالح حدثني الليث حدثني عقيل عن ابن شهاب (الزهري) أخبرني سنان بن أبي سنان الدؤلي ثم الجدري عن أبي واقد الليثي سمع النبي صلى الله عليه وسلم ...... لتركبن سنن من قبلكم.

کاتێک بوخاری دەڵێ: سنان بن أبي سنان تەنها لەم سێ هاوەڵە فەرموودەی بیستووە، دواتر فەرموودەی سنان دەهێنێ لە (أبو واقد الليثي)ەوە، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە بزانە ئەم فەرموودەیە زەعیفە چونکە سنان بن أبي سنان تەنها لە أبو هريرة و جابر و حسين بن علي فەرموودەی بیستووە، هیچ فەرموودەیەکی لە (أبو واقد) نەبیستووە.

وەکو ووتمان بوخاری پیشەی وایە لەم کتێبەدا کە باسی هەر ڕاویەک بکات ئەو فەرموودانەی ڕاویەکە دەهێنێت کە عیللەتی تێدا هەیە، چونکە کتێبەکەی تەنها ژیاننامە نیە بەڵکو کتێبی عیلەلیشە، ئەگەرچی بوخاری خۆی باسی ئەم شتەی نەکردووە بەڵام زانایانی فەرموودەناس بە وورد بوونەوە لە کتێبەکەی ئەم شتەیان بۆ دەرکەوتووە، هەروەک چۆن بوخاری لە صەحیحەکەیدا باسی مەرجەکانی خۆی نەکردووە لە کتێبەکەیدا، کەچی زانایانی فەرموودەناس بە وورد بوونەوە لە کتێبەکەی مەرجەکانی بوخاریان دیاریکردووە، ئەوەتا لە زۆر فەرموودەدا دەبینین نوسراوە لەسەر مەرجەکانی بوخاری و موسلیم (على شرط الشيخين) موسلیم لە پێشەکی صەحیحەکەی باسی مەنهەج و مەرجەکانی خۆیکردووە ئاسانە زانینی مەرجەکانی، بەڵام بوخاری باسی هیچ شتێکی نەکردووە بێ پێشەکی دەستی بە نوسینی

فەرموودەکە کردووە، ڕەحمەتی خوای لێبێت ناسراوە بەم شێوازە نوسین و دانانەی لە کتێبەکانیدا، وەکو ئەوەی بڵێی بۆ زانایەکی هاوشانی خۆی نوسیوە، ئەوەتا یەکێکی وە (ابن حجر العسقلاني) دەڵێ: سودێکی کەمم بینی لە کتێبی (التاريخ الكبير)ی بوخاری بەهۆی شێوازی دانانەکەی.

بۆیە زانای گەورەی یەمەن (المعلمي اليماني) دەڵێ: بوخاری پیشەی وایە کتێبەکانی بە شێوازێکی زەحمەت و نارِوون دەنوسێ، تاوەکو مێشکی خوێنەر بجووڵێنێت و خۆی ماندوو بکات لە تێگەیشتن و ببێتە ڕاهێنان بۆی.

(الترمذي) لە (علل الصغير)دا کە دەکەوێتە لاپەڕەکانی کۆتایی (سنن الترمذي) دەڵێ: ئەوەی لەم کتێبەدا باسم کردووە دەربارەی عیللەت و تاریخ و ڕاوییەکان، زۆرینەی لە کتێبی (التاريخ الكبير)ی بوخاری وەرم گرتووە.

**مەرجی دووەم:** عدالة الرواة (دادپەروەری ڕاوییەکان)

لێرەدا مەبەست لە دادپەروەری ئەوە نیە کە ڕاوییەکان گەر حوکمیان کرد لەنێوان دوو کەسدا بە دادپەروەری حوکم بکەن، وەکو ئەوەی ئێمە لێی تێگەیشتووین بەڵکو دادپەروەری (عدالة) مەبەست پێی زانستی (الجرح والتعديل)ە، کە زانستێکی تایبەتە بە زانستی فەرموودە، زانایانی جەرح و تەعدیل لە حاڵ و باڵی یەکە بە یەکەی ڕاوییەکانی فەرموودە دەکۆڵنەوە و شل و کەوی دەکەن، ئینجا بڕیار دەدەن کە ئایا ئەم ڕاوییە جێگای متمانەیە لە ڕووی عەدالەتەوە ؟ واتا ئایا کەسێکی درۆزن و فاسق و بیدعەچی و خاوەنی گوناهی گەورە و ....هتد ئەمانە نیە ؟ وە ئەگەر هەریەکێک لەمانەی تێدابێت ئەویش ڕێکخستنی بۆ کراوە کە چۆن فەرموودەی لێوەردەگیرێت و لێوەرناگیرێت.

ئێمەش ئەم مەرجە لەسەر سەنەدەکە جێبەجێ دەکەین بزانین ڕاوییەکان حاڵیان چۆنە، لەبەر ئەوەی سەنەدەکان گەلێک زۆرن ناتوانین لەسەر هەموویان ئەم مەرجە تاقی بکەینەوە چونکە زۆر بابەتە درێژە دەکێشێ، بەڵام هەندێک سەنەد بە ئاشکرا دیارە کە لەم مەرجە دەربازی نابێت چونکە کەسی تۆمەتبار بە درۆی تێدایە، وە هەندێک سەنەد بە ئاشکرا دیارە ڕاوییەکان لەم مەرجە دەربازییان دەبێت، تەنها (سنان بن أبي سنان) نەبێت، کە نە لە جۆری یەکەمیانە دەرنەچێ وە نە لە جۆری

دووەمیانە دەرچێ بە ئاسانی، بەهۆی نەناسراوی حاڵی واتا (مجهول الحال)ە، بەڵام خودی خۆی ناسراوە واتا (مجهول العين) نیە، (مجهول العين ئەوە کەسەیە کە تەنها یەک ڕاوی فەرموودەی لێوە ڕیوایەت بکات، بێ ئەوەی ئەم ڕاوییە تەوثیقی بکات، وە بێ ئەوەی هیچ زانایەکی تری "جەرح و تەعدیل" تەوثیقی بکەن، وە ڕیوایەتی مجهول العين یش ڕەت کراوەیە، بەڵام مجهول الحال ئەو کەسەیە کە دوو ڕاوی یان زیاتر فەرموودەی لێوە ڕیوایەت بکەن، بەڵام هیچ زانایەکی جەرح و تەعدیل تەوثیقی نەکەن، ڕیوایەتی مجهول الحال یش بە گشتی ڕەت کراوەیە، مەگەر تەنها بۆ "الشواهد و المتابعات" وەربگیرێت، هەروەک دێینە سەری إن شاء الله تعالى).

جا کە نازاندرێ کەسێکی چۆنە، ئێمەش ووتمان ئەم مەرجی دووەمە تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی حاڵ و باڵی ڕاوییەکان، وە هۆکاری سەرەکی نەزانینی حاڵی ڕاوی دەگەڕێتەوە بۆ کەمی سەرقاڵ بوونی ڕاوییەکە بە گێڕانەوەی فەرموودە و وەرگرتنی، بەم شێوەیەش ڕاوییەکە فەرموودەکەی کەمی لەلا دەبێت و قوتابی کەمی دەبێت، بۆیە تەنها ناوی دەبێت بەبێ زانینی حاڵەکەی.

(سنان بن أبي سنان)یش یەکێکە لەو ڕاوییانەی کە تەنها (الزهري و عمر بن داود) ڕیوایەتیان لێوەی کردووە، کەسی تر نیە ڕیوایەتی لێوە کردبێ، ئەگەرچی (عمر بن داود) خۆشی نەناسراوە (مجهول العين)ە واتا (سنان) تەنها دوو قوتابی هەیە، ئەوانیش الزهري و عمر بن داود، کە یەکێکیان خۆشی نەناسراوە هەروەک (العقيلي) دەڵێ: عمر بن داود خۆیی و شێخەکەشی نەناسراون (شێخەکەی سنان ە)، وەهەندێک دەڵێن (زيد بن أسلم)یش ڕیوایەتی کردووە لە (سنان بن أبي سنان) بەڵام وانیە، (زيد بن أسلم) ڕیوایەتی کردووە لە (أبي سنان)ەوە واتا باوکی سنان نەوەک خودی سنان، بەڵگەش بۆ ئەمە: البخاري لەکتێبی (التاريخ الكبير)دا دەربارەی ژیانی (أبي سنان)دا دەڵێ: قال لنا عبد الله حدثني الليث قال حدثني خالد عن سعيد بن أبي هلال عن زيد بن أسلم سمع أبا سنان الدؤلي. (ژمارە 3167 - بەرگی 8 - لاپەڕە 320).

وە هەر البخاري لەکتێبی (التاريخ الأوسط)دا دەربارەی ژیانی (أبي سنان واتا باوکی سنان) دەڵێ: وقال بعضهم حدثنا زيد بن أسلم عن أبي سنان. (بەرگی 1 - لاپەڕە 206).

وە ابن أبي حاتم لەکتێبی (الجرح والتعديل) دەڵێ: گوێ بیستی باوکم بووم دەیووت زيد بن أسلم ڕیوایەتی کردووە لە أبو سنان الدؤلي. (بەرگی 9 - لاپەڕە 251) بتصرف.

النسائي له كتێبی (الكنى)، وأبو أحمد لەكتێبی (الكنى) ، والدارقطني لەكتێبی (المؤتلف والمختلف) باسی ئەوە دەکەن کە زيد بن أسلم ڕیوایەتی کردووە لە أبو سنان. (هەروەک لە کتێبی: الشذا الفياح من علوم ابن الصلاح - برهان الدين الأبناسي)دا هاتووە لاپەڕە 578.

وە ئیمام مسلم لەکتێبی (المنفردات والوحدان)دا دەڵێ: یەکێک لەوانەی کە الزهري ڕیوایەتی لێوەکردووە وە غەیری الزهري کەسی تر ڕیوایەتی لێوەنەکردووە ئەوەی ئێمە زانی بێتمان ئەمانەن: چەند کەسێک دەهێنێت کە یەکێک لەوان (سنان بن أبي سنان الدؤلي)ە. (لاپەڕە 121 - 122) بتصرف. واتا ئەوەی ئیمام موسلیم بزانێت تەنها الزهري ڕیوایەتی کردووە لە سنان بن أبي سنان ەوە، کەسی تر ڕیوایەتی نەکردووە.

ئەمانەش بەڵگەن کە (زيد بن أسلم) ڕیوایەتی هەیە لە (أبو سنان)ەوە، نەوەک لە (سنان)ی کوڕی، بەڵکو (سنان) تەنها الزهري و عمر بن داود ڕیوایەتیان لێوە کردووە، وەکو پێشتر باسمان کرد، وە ئەوەی دەڵێ: زيد بن أسلم ڕیوایەتی هەیە لە سنان، با ڕیوایەتەکەمان بۆ بهێنێ، گریمان گەر هەشبێت ئەم فەرموودەیە (ذات أنواط) هەر نابێتە صحيح بە هەبوونی ڕیوایەتی زيد بن أسلم لە سنان بن أبي سنان ەوە.

بەهەر حاڵ ئێمە وەکو (العقيلي) ناڵێین: (سنان بن أبي سنان) مجهول العين ە بەهۆی هەبوونی ڕیوایەتی سنان بەشێوەی "المتابعات" لە "الصحيحين"دا بەڵام دەڵێین: مجهول الحال ە بۆیەش "بوخاری و موسلیم" ڕاستەوخۆ ڕیوایەتیان لێوە نەکردووە بەڵکو بەشێوەی "المتابعات" هێناویانە، واتا تا زانایەکی جەرح و تەعدیل نەڵێت جێگای متمانەیە و تەوثیقی نەکات نابێ ڕیوایەتی قبوڵ بکرێ، گەر دەڵێن ئەوەتا (ابن حبان و العجلي و المزي و الذهبي) تەوثیقیان کردووە، وە (الترمذي)ش فەرموودەکەی بە (حسن صحيح) داناوە، کەواتە سنان لەلای (الترمذي)ش جێگای متمانە بووە ئەگینا فەرموودەکەی بە (حسن صحيح) هەژمار نەدەکرد.

دەڵێین: بێگومان زانایانی جەرح و تەعدیل لە وەرگرتنی حوکمەکانیان دەربارەی هەر ڕاوییەک و فەرموودەیەک پلەیان جیاوازە، هەیانە زۆر توندە وەکو (أبو حاتم الرازي) کە ئەگەر تەنها ئەو جەرحی ڕاوییەک بکات بەبێ ئەوەی کەسی تری لەگەڵدا بێت لێی وەرناگیرێت بەهۆی زانینی توندییەکەی، وە هەیانە زۆر شلە وەکو (ابن حبان) کە بە تەوثیق کردنی کەسە نەناسراوەکان ناوی دەرکردووە، واتا گەر (ابن حبان) بە تەنها

تەوثیقی ڕاوییەک بکات لێی وەرناگیرێت بەهۆی زانینی شلیەکەی لە تەوثیق کردنی کەسانی نەناسراودا (توثيق المجاهيل).

وە هەیانە ناوەندی گرتووە نە توندە نە شل، وەکو (البخاري و مسلم و أحمد ... هی تر) وە ئەمانە پلەشیان بەرزترە لە زۆر زانای تری فەرمووەدەناس، بۆیە زۆرجار حوکمەکانی ئەوان وەردەگیرێت بەسەر حوکمی زانایانی تردا.

جا لێرەدا ووتەی زانایانی فەرمووەدەناس دەهێنین دەربارەی حوکمدانی هەندێک لەم فەرمووەدەناسانە:

ابن حبان:

ئەوەی بۆنی زانستی فەرمووەدەی کردبێت دەزانێت (ابن حبان) شلە لە تەوثیق کردنی کەسانی نەناسراو، بۆیە بۆ خۆپاراستن لە زیاتر درێژبوونەوە ووتەی زانایان ناهێنم دەربارەی (ابن حبان).

العجلي:

بەشێوەیەکی گشتی جەرح و تەعدیل کردنی (العجلي) قبوڵە لەلای زانایاندا و ئیعتیباری هەیە، تەنها لە زانایانی (المتأخرين) ڕەخنەی لێگیراوە لە تەوثیق کردنی بۆ کەسانی نەناسراو و زەعیف، وەکو (ابن الوزير اليماني و المعلمي اليماني و الألباني) کە وەسفیان کردووە بەوەی کت و مت وەک (ابن حبان) شلە لە تەوثیق کردندا، بەڵام زانایانی (المتقدمين) قسەی وایان نەکردووە لەسەری، بەگوێرەی ئەو کتێبانەی کە نوسراون و لێکۆڵینەوە کراوە بۆ حوکمەکانی (العجلي) لە جەرح و تەعدیل دا، وا دەردەکەوێ کە حوکمەکانی ئیعتیباریان هەیە تەنها ئەوانەی نەبێت کە تەنها خۆی تەوثیقی کردوون بە تەنها، یان تەنها (ابن حبان) هاوڕای بووە.

المزي:

لەبەر ئەوەی (سنان بن أبي سنان) ڕیوایەتی هاتووە لە "الصحيحين"دا، (المزي) سنان ی بە جێگای متمانە داناوە و تەوثیقی کردووە هەروەک لە (تهذيب الكمال في أسماء الرجال)دا، دەربارەی سنان دەڵێ: بوخاری و موسلیم فەرمووەدەی سنان یان ڕیوایەتکردووە، وە (أبو الحجاج المزي) و هاوشێوەکانی بەهۆی ئەوەی لە زانایانی (المتأخرين)ن پشت بە ووتەی زانایانی جەرح و تەعدیلی (المتقدمين) دەبەستن و لەنێوان حوکمەکانی ئەواندا تەرجیحات دەکەن، بەهۆی ئەوەی زانایانی (المتقدمين)

زاناتربوون لەوان و زیاتر شارەزای ڕاوییەکان بوون بەهۆی نزیکی سەردەمەکەیان لەوان، جا کەسێکی وەکو (المزي و الذهبي و ابن حجر العسقلاني ... هتد) کە دەڵێن فلان ڕاوی جێگای متمانەیە یان نا، پشت دەبەستن بە حوکمی زانایانی پێشووی وەکو (أحمد و علي ابن المديني و يحيى بن معين و البخاري و مسلم و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي ... هتد) نەوەکو حوکمی ئەوان پشت گوێ بخەن و لەخۆیانەوە حوکم بدەن، بەڵام ئەوان ئەهلی ئیجتیهادن لەکاتی خیلافی نێوان زانایاندا دەتوانن تەرجیح بکەن لەنێوان حوکمەکانیاندا، لە ئێستاشدا شتێک نەماوە بەناوی جەرح و تەعدیل بەڵکو ئەوەی هەیە تەنها ئەوەیە ووتەی زانایانی (المتقدمين) بهێنین و تەرجیح بکەین لەنێوانیاندا، ئەمەش پیشەی ئەهلی ئیجتیهادە نەوەک هەموو کەسێک، وە هەندێک لەم سەردەمە کە خۆیان بە زانا و ئیمامی جەرح و تەعدیل داناوە، جگە لە خۆهەڵخەڵەتاندن و لەخۆبایی بوون هیچی تر نیە، وە ئەوەی کە بە ناوی ئامۆژگاری بە خەڵکی دەڵێ گوێ لە فلان و علان مەگرن و هەجریان بکەن، دەتوانێت بڵێ وەکو ئامۆژگاری پێتانی دەڵێم بەڵام هەرگیز بۆی نیە بەناوی زانستی جەرح و تەعدیل و ئیمامی ئەم زانستە قسە بکات، چ جای ئەوەی کە یەکێک بەناوی ئیمامی جەرح و تەعدیلی ئەم سەردەمە دەڵێ: گەر البخاري و أبو حاتم و تەواوی زانایانی فەرموودە گەر وەک من بە ووردی دیراسەیان کردبوایە ئەوا دەگەیشتن بەو ئەنجامانەی کە من پێی گەیشتووم. واتا تەواوی زانایانی فەرموودە بە ووردی دیراسەیان نەکردووە، وە ئەگەر دیراسەشی بکەن لەو زیاتر شارەزا نابن بەڵکو تەنها دەگەن بە ئاستی ئەو زیاتر تێناپەڕن.

لەلای فەرموودەناسانیش باوە کە ڕاوییەک بوخاری و موسلیم فەرموودەی وەربگرن ئەوا ئەو ڕاوییە تایبەت مەندی خۆی دەبێت و پلەی بەرز دەبێت، هەر بۆیە کاتێک (خالد بن مخلد القطواني) کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی ناو صەحیحی بوخاری، فەرموودەیەک ڕیوایەت دەکات لە صەحیحی بوخاری کە بەژمارە **(6502)** هاتووە، (الذهبي) دەربارەی فەرموودەکە دەڵێ: گەر لەبەر هەیبەتی صەحیحی بوخاری نەبوایە ئەم فەرموودەیەم بە یەکێک لە فەرموودە مونکەڕەکانی (خالد بن مخلد القطواني) هەژمار دەکرد، مونکەڕیش واتا زەعیف.

بەڵام ئەمە لەکاتێکدایە گەر بوخاری یان موسلیم فەرموودەکە بە تەنها لە ڕاوییەکە ڕیوایەت بکەن بێ ئەوەی ڕاوی تری بدەنە پاڵ، ئینجا مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم

ڕاویە بوخاری و موسلیم قبوڵیان کردووە بە ڕاستەوخۆیی، بەڵام گەر ڕاویەکە ناوی لە پاڵ ڕاویەکی تری جێگای متمانە داهات (مقرونا بغیرە) واتای وایە خودی خۆی جێگای متمانە نیە بە تەنهایی بەڵکو بەهۆی ڕاویە متمانەدارەکەوە فەرموودەی لێوەرگیراوە، وەکو "الشواهد و المتابعات" هاتووە واتا ڕیوایەتە بەهێزەکە دەبێتە شایەت بۆ ئەوەی کە پێویستی بە شایەتە، مەعلومیشە گەر کەسێک خۆی جێگای متمانە بێ بە تەنها پێویستی بە شایەت نابێ.

## الشواهد والمتابعات چیە ؟

الشواهد: کۆی (شاهد)ە واتا شایەتەکان، بۆ نموونە: گەر ڕاویەک فەرموودەیەک ڕیوایەت بکات کە لە سەنەدەکەی هاوەڵی بەڕێز (عمر) هەبێت رضي الله عنه، وە ڕاویەکی تر هەمان فەرموودە ڕیوایەت بکات بە مانایەکی نزیک لەو، بەڵام لە سەنەدەکەی هاوەڵی بەڕێز (علي) هەبێت رضي الله عنه، واتا دوو هەواڵی جیا هەبن لە سەنەدەکاندا، ئەوا هەر فەرموودەیەک دەبێتە شایەت بۆ فەرموودەکەی تر.

المتابعات: کۆی (متابع)یە، واتا ڕاویەکە ڕاویەکی تری لەگەڵدایە لە ڕیوایەتی فەرموودەکەدا، بۆ نموونە: گەر ڕاویەک فەرموودەیەک ڕیوایەت بکات کە لە سەنەدەکەی هاوەڵی بەڕێز (عثمان) هەبێت رضي الله عنه، وە ڕاویەکی تر هەمان فەرموودە ڕیوایەت بکات وە لە سەنەدەکەی هەر (عثمان) هەبێت رضي الله عنه، ئەوا هەر فەرموودەیەک دەبێتە متابعی فەرموودەکەی تر.

زۆرجار دەبیستین زانایانی فەرموودەناس دەربارەی فەرموودەیەک دەڵێن:

ئەم فەرموودەیە (طرق و شواهد) یان (طرق) یان (شواهد)ی زۆرە یان هەیەتی.

طرق: بەمانای متابعات دێ واتا لە هەمان هاوەڵەوە سەنەدی تر هەن.

شواهد: بەمانای ئەوە دێ کە جگە لەم هاوەڵە هاوەڵی تر ڕیوایەتیان کردووە.

## سوود لە (الشواهد والمتابعات) چیە ؟

سوود لە دۆزینەوەی شواهد و متابعات ی فەرموودەکان ئەوەیە کە ڕاوی واهەیە حاڵی نەناسراوە یان زەعیفە وە فەرموودەیەکی ڕیوایەتکردووە، لەبەر حاڵ نەناسراوی یان زەعیفی ڕاویەکە ناتوانین پشت بە ڕیوایەتەکەی ببەستین تاوەکو ڕاویەکی بەهێز دەدۆزینەوە کە هەمان فەرموودەی ڕیوایەت کردبێ تاوەکو ببێتە شایەت یان متابع بۆ ڕاویە حاڵ نەناسراوەکە یان زەعیفەکە.

ئێمەش هەوڵمان داوە لەم کتێبەماندا لەبەر نەناسراوی حاڵی (سنان) تەواوی "الشواهد و المتابعات"ەکانی ئەم فەرموودەیە کۆبکەینەوە تاوەکو بزانین فەرموودەی (ذات أنواط) دەبێتە صحیح یان نا ؟ بەڵام هەروەکو بینیتان لەکۆی ئەم هەموو سەنەدەی کە هێنامان دەربارەی فەرموودەکە، ڕیوایەتەکەی (سنان) هیچ متابعەیەکی نیە، واتا هیچ کەسێکی تر ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت نەکردووە لە (أبي واقد الليثي)ەوە جگە لە سنان، بەڵام ڕیوایەتەکەی (سنان) دوو شایەتی هەیە کە ئەوانیش دوو سەنەدەکەی (كثير لە عبد الله ی باوکیەوە ئەویش لە عمرو بن عوف ی باوکیەوە) و (الواقدي لە ابن أبي حبيبة ەوە ئەویش لە داود بن الحصين ەوە ئەویش لە عكرمة وە ئەویش لە ابن عباس ەوە)، بەڵام دەبێت بڕوانین کە ئایا ئەم دوو سەنەدە دەتوانن ببن بە شایەت بۆ سەنەدەکەی (سنان)و بیکەن بە صحیح یان نا (کە دواتر باسی هەردووکیان دەکەین)، چونکە مەرجی شایەت و متابع ئەوەیە کە دەبێت ڕاوییەکە بەهێزو جێگای متمانە بێ تاوەکو بتوانێ پشتی ئەو ڕاوییە بگرێ کە حاڵ نەناسراوە یان زەعیفە، وە ئەگەر هاتو شایەتەکە یان متابعەکە خۆشی حاڵ نەناسراو بوو یان زەعیف بوو یان متروك بوو، ئەوا ناتوانێت ڕیوایەتەکەی تر بەهێز بکات ئەگەرچی شایەت و متابعەکان دە کەس زیاتریش بن.

نموونەیەکی سادە لەسەر شایەت و متابع :

سێ کەس هەن بەناوی محمد و زید و عمرو، محمد جێگای متمانەیە و باوەڕپێکراوە، زید و عمرو نازاندرێ حاڵیان چۆنە یان جێگای متمانە نین، گەر زید بە تەنها خۆی قسەیەکت بۆ بهێنێ، ناتوانی بە درۆی بخەیتەوە، وە ناتوانی باوەڕیشی پێ بکەی چونکە حاڵی نازانی، بەڵام گەر هاتو محمدیش هەمان قسەکەی زیدی بۆ هێنای ئەوکات بەهۆی محمدەوە دەزانی کە قسەکەی زید ڕاست بووە، بەڵام لەبڕی محمد ئەگەر هاتو عمرو هەمان قسەکەی زیدی بۆ هێنای، ناتوانی باوەڕ بە عمرو بکەین چونکە ئەویش وەکو زید حاڵی نەزاندراوە یان جێگای متمانە نیە.

(سنان بن أبي سنان)یش بەهەمان شێوە هیچ ڕیوایەتێکی نیە لە "الصحيحين"دا کە بوخاری یان موسلیم بە تەنها پشتیان بەو بەستبێ، بەڵکو تەنها دوو فەرموودەی هەیە لە "الصحيحين"دا، هەردووکیشی تیایدا پشت بەستراوە بە کەسێکی متمانەدار کە

أبو سلمة یە نەوەک خودی سنان، وە ڕیوایەتی سنان یش تەنها وەکو "المتابعات" هاتووە.

ئەو دوو فەرموودەیەی (سنان بن أبي سنان) تێدایە لە "الصحيحين"دا:

**فەرموودەی یەکەم:**

صحيح البخاري – **2910 :** حدثنا أبو اليمان أخبرنا شعيب عن الزهري قال حدثني **سنان بن أبي سنان الدؤلي وأبو سلمة بن عبد الرحمن** أن جابر بن عبد الله رضي الله عنهما أخبر أنه غزا مع رسول الله صلى الله عليه وسلم .....

صحيح البخاري – **2913 :** حدثنا أبو اليمان أخبرنا شعيب عن الزهري حدثنا **سنان بن أبي سنان وأبو سلمة أن جابرا أخبره** ...... هەمان فەرموودە.

صحيح البخاري – **4134 :** حدثنا أبو اليمان حدثنا شعيب عن الزهري قال **حدثني سنان وأبو سلمة** أن جابرا أخبر أنه غزا مع رسول الله صلى الله عليه وسلم .....

صحيح مسلم – **6091 :** وحدثني عبد الله بن عبد الرحمن الدارمي وأبو بكر بن إسحاق قالا أخبرنا أبو اليمان أخبرنا شعيب عن الزهري **حدثني سنان بن أبي سنان الدؤلي وأبو سلمة بن عبد الرحمن** أن جابر بن عبد الله الأنصاري أخبرهما أنه غزا مع النبي صلى الله عليه وسلم .....

**فەرموودەی دووەم:**

صحيح البخاري – **5717 :** حدثنا عبد العزيز بن عبد الله حدثنا إبراهيم بن سعد عن صالح عن ابن شهاب (الزهري) قال **أخبرني أبو سلمة بن عبد الرحمن وغيره** أن أبا هريرة رضي الله عنه قال إن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: لا عدوى ولا صفر ولا هامة .....

قال البخاري : رواه الزهري **عن أبي سلمة و سنان بن أبي سنان.**

صحيح مسلم – **5919 :** حدثني أبو طاهر وحرملة بن يحيى - واللفظ لأبي طاهر - قالا أخبرنا ابن وهب أخبرني يونس قال ابن شهاب (الزهري) **فحدثني أبو سلمة بن عبد الرحمن** عن أبي هريرة حين قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: لا عدوى ولا صفر ولا هامة .....

صحيح مسلم – **5920 :** وحدثني محمد بن حاتم وحسن الحلواني قالا حدثنا يعقوب (وهو إبراهيم بن سعد) حدثنا أبي عن صالح عن ابن شهاب (الزهري) أخبرني **أبو سلمة بن عبد الرحمن وغيره** أن أبا هريرة قال إن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: لا عدوى ولا طيرة ولا صفر ولا هامة .....

صحيح مسلم – **5921 :** وحدثني عبد الله بن عبد الرحمن الدارمي أخبرنا أبو اليمان عن شعيب عن الزهري **أخبرني سنان بن أبي سنان الدؤلي** أن أبا هريرة قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: لا عدوى .....

هەروەک دەبینن (سنان بن أبي سنان) تەنها ئەم دوو فەرموودەیەی هەیە لە "الصحيحين"دا ئەویش بە چەند سەنەدێکی جیاواز کە لە هەموویاندا سنان لەگەڵ أبو سلمة بن عبد الرحمن بەیەکەوە ڕیوایەتیان کردووە لە جابر و أبو هريرة، ڕوونیشە لەلای فەرموودەناسان کە ڕاوییەکی زەعیف یان نەناسراو درایە پاڵ ڕاوییەکی تری جێگای متمانە، مانای وایە ڕاوییە بەهێزەکە دەبێتە شایەت یان متابع بۆ ڕاوییە لاوازەکە یان نەناسراوەکە، کە هەمیشە پێویستی بە شایەت و پشتگیری دەبێت "الشواهد والمتابعات"، لێرەش لە پیشەی ئیمام بوخاری و موسلیم بۆمان دەردەکەوێ کە بۆیە هیچ ڕیوایەتێکی سنان یان بە تەنها وەرنەگرتووە و هەموویان لەگەڵ أبو سلمة هێناوە، چونکە سنان حاڵی دیارە کە پێویستی بە "الشواهد و المتابعات"ە وە أبو سلمة حاڵی دیارە کە یەکێکە لە تابعینە هەر دیار و ناسراوەکان کوڕی هاوەڵی بەڕێز (عبد الرحمن بن عوف)ە، بەڵام خودی خۆی کەسێکی بەهێزە و جێگای متمانەیە نەوەکو لەبەر باوکی جێگای متمانە بێ، وە قسەی زانایانی جەرح و تەعدیل لە ستایشی أبو سلمة ئەوەندە زۆرە کە جێگای باسکردن نیە لێرەدا.

کەواتە گەر أبو سلمة نەبوایە بوخاری و موسلیم ڕیوایەتی سنان بن أبي سنان یان نەدەهێنا و پشتیان پێی نەدەبەست بە تەنها، لە هەما کاتیشدا کە بە شێوەی "المتابعات" هێناویانە مانای دوو شت دەدات:

**یەکەمیان:** سنان بن أبي سنان گەر بە تەنها شتێکی ڕیوایەتکرد (تفرد به) ئەوا لێی وەرناگیرێت تاوەکو کەسێکی جێگای متمانە دەبێتە شایەتی یا متابع بۆ ڕیوایەتەکەی.

**دووەمیان:** سنان بن أبي سنان لەو ڕاوییانە نیە کە فەرموودەکانی وازلێ بهێندرێ واتا (متروك الحدیث)نیە، بەڵکو ڕیوایەتەکانی دەنوسرێتەوە تاوەکو گەرشایەت یان متابعی بۆ دۆزرایەوە قبوڵ بکرێ.

لە جەرح و تەعدیلدا کەسێک وەکو سنان بێ زانایان دەربارەی دەڵێن: (یكتب حدیثه) واتا فەرموودەکانی دەنوسرێتەوە بە ئیعتیباری ئەوەی وەکو شایەت و متابع پشتی پێ ببەسترێ، نەوەک بە تەنها پشتی پێ ببەستن بەبێ شایەت و متابع.

الذهبي:

وەکو لەپێشوودا باسمان کرد کە الذهبي ئەهلی ئیجتهادە لەنێوان حوکمی زانایانی المتقدمین نەوەکو زانای جەرح و تەعدیل بێت، گەرچی الذهبي دەربارەی سنان دەڵێ: (ثقة) بەڵام هەر خۆشی ووتەی العقیلي نەقل دەکات دەربارەی سنان کە العقیلي وتوویەتی: سنان مەجهولە واتا مجهول العین، بەمەش بەهەموو شێوەیەک ڕیوایەتی ڕەت کراوەیە.

بەڵام ئێمە شوێنی ئەو ووتانە ناکەوین کە بە دڵمانە، وە ئەو ووتانەش پشت گوێ ناخەین کە بە دڵمان نیە، بەڵکو شوێنی حەق و ووتەی بەهێزتر و ڕاستر دەکەوین، ئەوەتا دوو زانای وەکو چیا لە زانستی فەرموودە کە بوخاری و موسلیم ن، ڕیوایەتی سنان یان بە جێگای متمانە دانەناوە و ڕەتیشیان نەکردۆتەوە بەڵکو فەرموودەکانیان نوسیوە بۆ ئیعتیبار، گەرکەسێکی متمانە بوو بە شایەت و متابعی ئەوا قبوڵی دەکەن، وە ئەگەرهیچ کەسێکی متمانە نەبوو بە شایەت و متابعی قبوڵ ناکرێ، ئێمەش لەسەر مەنهەجی ئەم دوو ئیمامە گەورە دەڕۆین و وادەکەین دەربارەی ڕیوایەتەکانی سنان، ئەمەش لەبەرئەوە نیە کە دەمارگیری (تعصب)مان بۆ ئەم دوو ئیمامە هەبێت، بەڵکو قەدری گەورەیی ئەم دوو ئیمامە دەزانین بۆیە حوکمی ئەوان بە ڕاجح دادەنێین و حوکمی موخالیفەکانیان بە مرجوح دادەنێین، هەروەک زانیمان سنان لەم فەرموودەیەدا (ذات أنواط) کەس نەبۆتە متابعی لە ڕیوایەتکردنی لە (أبي واقد اللیثي)ەوە، بەڵام دوو شایەتی هەیە لە ڕیوایەتی (عمرو بن عوف المزني و ابن عباس) رضي الله عنهما کە دواتر دێینە سەرئەم دوو سەنەدەش تا بزانین بۆ شایەتی دەست دەدەن یان نا ؟ سەرەڕای ئەوەش باسمان کرد کە سنان لە أبي واقد هیچ فەرموودەیەکی نەبیستووە هەروەک لە مەرجی یەکەمدا هێنامان.

الترمذي:

دەربارەی فەرموودەکە دەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی (حسن صحیح)ە.

سەرەتا دەبێ بزانین (حسن) مانای چی دەدات لەلای ئیمام الترمذي، چونکە بەهۆی ئەوەی ئیمام الترمذي بە یەکێک لە زانایانی (المتقدمین) دادەنرێ لە سەردەمی ئەودا زانایان زیاتر خەریکی جێبەجێ کردن بوون (تطبیقات) واتا ئەو شتانەی دەیانزانی جێبەجێیان دەکرد لەسەر فەرموودەکاندا زۆر بە ووردی، بەڵام زۆر بە کەمی باسی دەستەواژەکانی زانستی فەرموودەیان دەکرد، وە کەسیان کتێبی نەنوسیوە لەسەر دەستەواژەکانی زانستی فەرموودە، تاوەکو (الرامهرمزي 360 هـ) کتێبی دەربارەی نوسی بەناوی (المحدث الفاصل بين الراوي والواعي)، بەڵام زانایانی (المتأخرين) لەساڵی 300 هـ بەسەرەوە وەکو زانایانی (المتقدمین) لە جێبەجێ کردنی حوکمەکان وورد و لێزان نەبوون، بەڵام ئەوان دەستێکی باڵایان هەبوو لە نوسینی دەستەواژەکانی فەرموودەدا، ئەمەش لە هەموو زانستێکدا بوونی هەیە، دەبینی زاناکانی سەرەتا زۆر زیرەکترو ووردتر بوونە، زاناکانی دواتر وەکو ئەوان زیرەک نەبوونە بەڵام لەڕووی نەزەرییەوە هەموو زانستەکەیان شیکردۆتەوە، هەر بۆیەش هەرچی کتێبی دەستەواژەکانی فەرموودەیە نوسەرەکەی لە (المتأخرين)ە، بەڵام لە زانین و ووردبینیدا هەردەم (المتقدمین) لە پێشەوەن، (الترمذي)ش لەبەر ئەوەی لە زانایانی پێشووە ئەو دەستەواژانەی کە بەکاری هێناوە بە تەواوی یەک ناگرێتەوە لەگەڵ ئەو دەستەواژانەی کە زانایانی (المتأخرين) نوسیویانە لە کتێبەکانی دەستەواژەدا.

یەکێکیش لەم دەستەواژانە بە نموونە: دەستەواژەی (حسن)ە کە سونەنی الترمذي پڕاوپڕە لەم دەستەواژەیە، لەلای (المتأخرين) دەستەواژەی (حسن) بۆ ئەو فەرموودەیە بەکاردێ کە هەمان پێنج مەرجەکەی فەرموودەی (صحیح)ی تێدایە تەنها ئەوە نەبێت کە توانای لەبەرکردن (ضبط الرواة) کزترە لە هی صحیح.

بەڵام لەلای (المتقدمین) دەستەواژەی (حسن) بە زۆر مانا هاتووە، بە مانای صحیح، بە مانای حسن، بە مانای زەعیفێک کە شواهد و متابعاتی هەیە، وە هەندێکجار تەنها بۆ مەتن بەکارهاتووە، وە هەندێکجار تەنها بۆ سەنەد.

الترمذي له کتێبەکەیدا پێناسەی (حسن)ی کردووە کە مەبەست پێی چیە، هەروەک دەڵێ: هەر فەرموودەیەک کە لەم کتێبەدا دەربارەی وتوومە (حسن) ئەوا مەبەستم پێی سەنەدەکەی بووە، ئەویش ئەمەیە کە هەر فەرموودەیەک ڕیوایەت بکرێ ڕاوی تۆمەتبار بە درۆ لە سەنەدەکەیدا نەبێت و شاذ نەبێت و سەنەدی تری هەبێت بە مەتنێکی نزیک لە ماناکەی.

شاذ بە کورتی بە دوو مانا دێت :

یەکەم: ڕاویەکی جێگای متمانە پێچەوانەی کۆمەڵێک ڕاوی تری متمانە بکات لە سەنەد یان مەتنی فەرموودەکە.

دووەم: کەسێک بە تەنها فەرموودەیەک ڕیوایەت بکات (تفرد به) کەچی ئەم کەسە شایەنی ئەوە نەبێت کە بە تەنها فەرموودەیەک ڕیوایەت بکات.

کەواتە گەر ڕاوی زەعیف بوو یان مجهول هەبوو، یان سەنەدەکە پچڕاوبوو لەلای الترمذي هەر بە (حسن) دادەنرێ، ئەمەش پێچەوانەی پێناسەی (المتأخرين)ە بۆ فەرموودەی (حسن)، بەڵام لێرەدا ناکرێ ڕەخنە لە (الترمذي) بگیرێت لەبەر ئەوەی:

یەکەم: لە سەردەمی ئەودا بەهۆی زۆر گرنگی نەدان بە دەستەواژەکان زانایان هەموو کۆک نەبوونە لەسەر دەستەواژەکاندا بە گشتی.

دووەم: پێناسەی حەسەنی کردووە و ڕوونی کردۆتەوە هیچ کێشەیەکی تێدانیە، بەڵام گەر ڕوونی نەکردبوایە ئەوکات کێشەی زۆری بەدوای خۆیدا دەهێنا.

سێیەم: هەروەک دەووترێ (لا مشاحة في الإصطلاح) واتا ناکۆکی نیە لە بەرکاهێنانی دەستەواژەدا، جا ئەمە لە ئێستادا بووترێ لە سەردەمی الترمذي دا زۆر حەقترە بووترێ بەهۆی نەنوسینەوەی دەستەواژەی فەرموودەکان، ئەمەش مانای ئەوە نیە ئێستا هەر کەسێک ئازادە لەوەی چ دەستەواژەیەک بۆ صحيح و ضعيف و حسن دادەنێت بەدڵی خۆی، چونکە لەئێستادا زۆربەی دەستەواژەکانی زانستی فەرموودە یەکدەنگی لەسەرە لە پێناسەکردنی بەشێوەیەکی گشتی.

جا الترمذي خۆی پێی ووتین کە تەنها سێ مەرجی هەیە بۆ بە حەسەن دانانی فەرموودە، وە لەلای ئەو پچڕانی سەنەد و هەبوونی ڕاوی زەعیف و نەناسراو و توانای لاوازی لەبەرکردن نابێتە هۆی ئەوەی کە نەڵێت فەرموودەکە حەسەنە، بەڵام ئەو

دەربارەی فەرموودەی (ذات أنواط) بە ڕیوایەتی (سنان) ناڵێ حەسەن، بەڵکو دەڵێ حسن صحيح، ئەم دەستەواژەیەش لەلای الترمذي بەمانای (صحيح) دێت.
بێگومان الترمذي یەکێکە لە زانایە گەورەکانی زانستی فەرموودە، گەرچی پلەی ناگات بە بوخاری و موسلیم و أحمد و أبو حاتم و أبو زرعة و النسائي ...، بەڵام پلەیەکی بەرزی هەیە لە زانستی فەرموودەدا، هەروەک الذهبي دەربارەیدا دەڵێ:
کتێبی جامعەکەی (کە ناسراوە بە سنن الترمذي) ئیمامەتی و توانای لەبەرکردن و شارەزایی لە فیقهدا نیشان دەدات بۆ الترمذي، بەڵام شلە لە قبوڵکردنی فەرموودەدا و توند نیە، وە لە تضعيف کردندا نەرمە (واتا نەرمە بەرامبەر ڕاوییە زەعیفەکان و فەرموودە زەعیفەکان). **سير أعلام النبلاء - 276/13.**
وە هەر الذهبي دەربارەی الترمذي دەڵێ:
هەڵمەخەڵەتێ بە حوکمدانی الترمذي کاتێک فەرموودەیەک بە (حسن) دادەنێت، لەکاتی لێکۆڵینەوەدا زۆرینەی زەعیفە. **ميزان الإعتدال في نقد الرجال - 231/7.**
وە هەر الذهبي دەربارەیدا دەڵێ:
الترمذي فەرموودەی (كثير بن عبد الله بن عمرو بن عوف عن أبيه عن جده) ڕیوایەتکردووە (بەژمارە 1352) وە بە صەحیحی داناوە، هەر بۆیە زانایان پشت نابەستن بە تصحیحی الترمذي. **ميزان الإعتدال في نقد الرجال - 493/5.**
بۆیە الذهبي وادەڵێ چونکە زۆربەی زانایان هاوڕان لەسەر ئەوەی ڕیوایەتی كثير بن عبد الله بن عمرو بن عوف عن أبيه عن جده زەعیفە.
وە الذهبي دەڵێ: الترمذي شلە بەرامبەر ڕاوییەکاندا. **تاريخ الإسلام - 352.**
وە هەروەها دەڵێ: لە جەرح کردنی ڕاوییەکاندا زەعیفە. **تاريخ الإسلام - 460.**
بەڵام الذهبي زیادەڕەوی پێوە دیارە لە حوکمدانی لەسەر الترمذي بەوەی کە تصحیح و تحسین ی الترمذي پشتی پێ نابەسترێ، وە هەروەها لەبەر ئەوەی کە فەرموودەی كثير بن عبد الله بە صەحیح داناوە زانایان پشت بە تصحیح ی الترمذي نابەستن !!!
ئەم ووتەیە جێگای تێڕامانە و زیادە ڕەوی و توندی پێوە دیارە، الذهبي بەوە ناسراوە کە باسی یەکێک دەکات دوو وەسفی دژ بەیەکی بۆ دەکات بە تایبەتی لەکتێبی (سير أعلام النبلاء)دا، کە باسی کەسێک دەکات کۆمەڵێک ستایشی دەکات لەکۆتاییدا دەڵێ: بەڵام شیعەیە، یان قەدەرییە، یان موعتەزیلەیە یان ئاوا و ئاوایە، لێرەشدا دەربارەی

الترمذي دەڵێ: کتێبەکەی شایەتی ئیمامەتی و حفظ و شارەزابوونی لە فیقهدا نیشان دەدات، بەڵام پشت بە تصحیح و تحسین ی ئەو مەبەستە چونکە زۆربەی زەعیفە !!! جا کەسێک کتێبێک بنوسێ کۆمەڵێک فەرموودەی زەعیف بە صحیح و حسن دابنێ، چۆن کتێبەکە شایەتی ئیمامەتی و زانست بۆ ئەو کەسەدا دەدات ؟ بەڵکو بەپێچەوانە دەبێت.

گەر تەنها باسی ئەوەی کردبوایە پشت بەو فەرموودانە نابەسترێ کە الترمذي وتوویەتی (حسن)ە ڕاست بوو چونکە حەسەن لەلای الترمذي شتێکی ترە، بەڵام الذهبي دەڵێ پشت بە تصحیحیشی نابەسترێ !!!

ابن دحية دەربارەی الترمذي دەڵێ:

چەندەها فەرموودەی هەڵبەستراو و سەنەدی زەعیفی بە حەسەن داناوە لە کتێبەکەیدا. **الزيلعي - نصب الراية - 217/2.**

منیش دەڵێم: ئەمەش زیادەڕەوییەکی ڕوون و ئاشکرای (ابن دحية)یە.

ابن القيم دەربارەی الترمذي دەڵێ:

الترمذي فەرموودەی وا بە صحیح دادەنێت کە جگە لەو هیچ زانایەکی تر بە صەحیحی دانەناوە، بەڵکو فەرموودەی وا بە صحیح دادەنێت کە زانایانی تر بە زەعیفیان داناوە و ئینکارییان کردووە.

دەڵێم: رحمه الله وەکو شێخەکەی بە ئینصافە لە حوکمدان.

وە هەروەها دەڵێ: الترمذي فەرموودەی (كثير بن عبد الله بن عمرو بن عوف)ی بە صەحیح داناوە، وە أحمد فەرموودەی ئەو زۆر بە زەعیف دادەنێت، وە بە عبد الله ی کوڕی ووتوە: ڕیوایەت مەکە لە (كثير)ەوە.

وە أحمد دەربارە (كثير) وتوویەتی: فەرموودەکانی مونکەرە، هیچ نیە.

يحيى بن معين وتوویەتی: فەرموودەکانی هیچ نین و نانوسرێنەوە.

النسائي والدارقطني وتوویانە : وازلە فەرموودەکانی هێنراوە (متروك الحديث).

الشافعي ووتویەتی: ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی درۆ.

ابن حبان وتوویەتی: كثير لە باوک و باپیریەوە ڕیوایەت دەکات، ئەم سەنەدەش نوسخەیەکی هەڵبەستراوە، حەڵاڵ نیە باسبکرێ لە کتێبەکان و ڕیوایەتەکاندا تەنها بۆ سەرسام بوون نەبێت. **الفروسية المحمدية : 184 - 185**

وە هەروەها ابن القيم دەڵێ: الترمذي جۆرێک لە شلی تێدایە لە تصحيح كردندا.
**زاد المعاد - 348/2.**

ووتەی ئەم زانایانە دوو سوودی هەیە بۆمان :

**یەکەم:** الترمذي ڕیوایەتی (كثير بن عبد الله عن أبيه عن جده) بە صحیح داناوە، کەچی ئەم زانایانە بەم شێوەیە باسی کثیر و ئەم ڕیوایەتەیان کرد، ئەمەش نیشانەی شلی الترمذي نیشان دەدات لە تصحیح دا بەڵام نەوەک بە ڕەهایی.

**دووەم:** سەنەدی دووەمی فەرموودەی (ذات أنواط) بە (كثير بن عبد الله عن أبيه عن جده) تێدەپەڕێ، کە بینیمان زانایان چییان ووت دەربارەی کثیر و ئەم سەنەدە، ئەمەش لە ئێستاوە ئاماژەیەکی خێرایە بۆ ئەوەی کە سەنەدی دووەمی فەرموودەی (ذات أنواط) حاڵی خراپترە لە سەنەدی یەکەم چ جای ئەوەی ببێتە شایەت بۆی، هەروەک دواتر باسی دەکەین إن شاء الله تعالى.

المباركفوري شەرحکەری سنن الترمذي دەڵێ:

الترمذي لەگەڵ ئیمامەتی و گەورەییەکەیدا لە زانستی فەرموودە بەڵام شلە لە تصحيح و تحسين ی فەرموودەدا. **تحفة الأحوذي - 240.**

بۆ زانینی زیاتر دەربارەی مەنهەجی الترمذي و تێگەیشتن لە دەستەواژەکانی الترمذي ئەم سێ کتێبە بخوێننەوە:

شرح علل الترمذي – ابن رجب.

الحديث الحسن لذاته ولغيره دراسة إستقرائية نقدية بەرگی سێیەم – خالد الدريس.

آراء المحدثين في الحديث الحسن لذاته ولغيره – خالد بن منصور الدريس.

بەڵام کۆی ئەم ووتانەی سەرەوە مانای ئەوە نیە کە حوکمەکانی الترمذي لەسەر فەرموودەدا ڕەت بکەینەوە بەیەکجاری، بەڵکو دەبێت سەیری ئەم فەرموودانە بکەین کە الترمذي بە حسن یان صحیحی داناوە ئایا هیچ شتێکی پێچەوانەی قاعیدەکانی زانستی فەرموودەیە ؟ گەر زانیم پێچەوانەیە ئەوا حوکمی الترمذي ڕەت دەکەینەوە، وە ئەگەر الترمذي فەرموودەیەکی بە حسن یان صحیح دانابووە بەڵام زانایانی تری لەو زیرەکتر وەک البخاري و مسلم و أحمد و ابن معين و ابن المديني و دوو ڕازییەکە و النسائي ... پێچەوانەی ئەوبوون ئەوا حوکمەکەی الترمذي ڕەت دەکەینەوە.

هەروەک المعلمي اليماني دەڵێ:
توندی و شلی شتێکی جێگیر نیە، هی وا هەیە توندە بەڵام لە حوکمێکدا شلە، وە هی وا هەیە شلە لە حوکمێکدا توندی دەنوێنێ.
نموونەش لەسەر قسەکەی المعلمي اليماني ئەوەیە کە الترمذي سەرەڕای شلی لە تحصیح و تحسین دا هەندێک کات، بەڵام جاری وا هەبووە فەرموودەیەکی بە (غریب) داناوە واتا (ضعیف) کەچی فەرموودەکە بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، بەڵام بێ گومان حوکمی بوخاری و موسلیم ڕاسترە لە هی الترمذي دوای لێکۆڵینەوە لە فەرموودەکە.
سەبارەت بەوەش کە الترمذي وتوویەتی: (باب ما جاء لتركبن سنن من كان قبلكم) واتا سەرە بابەتەکەی بەناوی (ما جاء لتركبن سنن من كان قبلكم)ە، وە دواتر کە دەڵێ: (وفي الباب عن أبي سعيد وأبي هريرة) واتا لەسەر هەمان سەرە بابەت فەرموودە هەیە کە لە (أبو سعيد الخدري و أبو هريرة) ڕیوایەت کراوە رضي الله عنهما.
مانای ئەوە نیە کە فەرموودەی (ذات أنواط) أبو سعيد و أبو هريرة ش ڕیوایەتیان کردبێ، بەڵکو واتای ئەوەیە کە دەربارەی بابەتی (ما جاء لتركن سنن من كان قبلكم) دوو فەرموودەی تر هەن کە ئەم دوو هاوەڵە ڕیوایەتیان کردووە، ئەوانیش هەردووکی لە صەحیحی بوخاریدا هەیە (باب قول النبي صلى الله عليه وسلم : لتتبعن سنن من كان قبلكم)
صحيح البخاري – **7319 : عن أبي هريرة** رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: لا تقوم الساعة حتى تأخذ أمتي بأخذ القرون قبلها، شبرا بشبر وذراعا بذراع، فقيل يا رسول الله كفارس والروم ؟ فقال: ومن الناس إلا أولئك.
صحيح البخاري – **7320 : عن أبي سعيد الخدري** عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: لتتبعن سنن من كان قبلكم شبرا شبرا وذراعا بذراع، حتى لو دخلوا جحر ضب تبعتموهم، قلنا يا رسول الله اليهود والنصارى ؟ قال: فمن.
هەروەک دەبینین بوخاری ئەم دوو فەرموودەیەی هێناوە لە أبو سعيد و أبو هريرة هەروەک الترمذي ئاماژەی پێداوە، وە هەردووکیان لە هەمان (باب) واتا سەرە بابەت هێناویانە بەناوی (لتركبن و لتتبعن سنن من كان قبلكم)، وە زانیمان کە دوو فەرموودەکەی أبو سعيد و أبو هريرة باسی ڕووداوی (ذات أنواط)ی تێدا نیە.

بەڵام بەداخەوە یەکێک لە فەرموودەناسانی ئەم سەردەمە کە دەربارەی ئەم فەرموودەیە سوودم زۆر لێی بینیوە، دەڵێ: ئەم کارەی الترمذي کە دەڵێ: (وفي الباب عن أبي سعيد وأبي هريرة) وا لە خوێنەر دەکات کە وابزانێت فەرموودەی (ذات أنواط) ئەم دوو هاوەڵەش ڕیوایەتیان کردووە، ئەم کارەش شێواندنی خوێنەر و شاردنەوەیەی ڕاستیەکانە کە الترمذي کردوویەتی !!! بەداخەوە ئەم کارە بدرێتە پاڵ ئیمامێکی گەورە و بەڕێزی وەکو الترمذي، ئەمە لەکاتێکدا الترمذي خۆی ڕوونی کردۆتەوە و نوسیویەتی سەرە بابەتەکە بریتیە لەمە، وە دەربارەی ئەم سەرە بابەتە أبو سعيد و أبو هريرة ش فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە، ئیتر نازانم ئەمە چ شێواندنێک و شاردنەوەیەکی ڕاستیەکانە !!! الله تعالى لێمان خۆشبێ.

لەمەشدا دووبارە سوودێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ دەربارەی فەرموودەی (ذات أنواط) ئەویش ئەمەیە کە بوخاری لە صەحیحەکەیدا وەکو بینیتان بابێکی داناوە بەناوی (باب لتتبعن سنن من كان قبلكم) دواتر ئەو فەرموودانەی هێناوە کە ئەم ڕستەیەی لە خۆ گرتووە وەکو بینیتان کەمێک پێش ئێستا، بەڵام فەرموودەی (ذات أنواط)ی نەهێناوە کە ئەویش هەمان ئەم ڕستەیەی تێدایە، بەمەش بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم فەرموودەیە لەلای بوخاری زەعیفە و شایەنی ئەوە نیە بەشێوەی (شایەت و موتابەعە)ش بهێندرێ بۆیە بوخاری نەیهێناوە لە صەحیحەکەیدا ئەگینا بەشێوەی (شایەت) دەیهێنا بۆ فەرموودەکانی (أبو سعيد و أبو هريرة)، هەروەک لە کتێبی (التاريخ الكبير)یش ئاماژەی بە زەعیفی فەرموودەکە داوە لە ژیاننامەی (سنان بن أبي سنان)دا کە لە پێشوودا باسمان کرد.

الألباني:

ئەلبانیش ئەم فەرموودەیەی بە صحيح داناوە بەکۆی شایەتەکانی.

بێگومان الألباني لەسەر مەنهەجی (المتأخرين)ە لە حوکمدان لەسەر فەرموودەدا، ئەو مەنهەجەش بەوە ناسراوە کە لە تصحيح کردن و تحسين کردندا زۆر پشت بە موتابەعە و شایەتەکان دەبەستن، هەر فەرموودەیەکی زەعیف هەبێ بەدوای موتابەعە و شایەت دەگەڕێن بۆی تا فەرموودەکە بەرزدەکەنەوە بۆ حسن یان صحيح، ئەمەش هەمیشە وانیە بەڵام زۆربەی کات وایە بەهۆی ئەو فراوانیەی کە لەم بابەتەدا گرتویانەتە بەر، کەچی (المتقدمين) فەرموودەی واهەبووە بیست موتابەعە و شایەتی

هەبووە کەچی هەر بە زەعیفیان داناوە، چونکە زانیویانە کە هەموو موتابەعە و شایەتێک بۆ ئەوە دەست نادات ببێتە هۆی بەرزکردنەوەی فەرموودەیەکی زەعیف بۆ حسن یان صحیح.

الألباني خۆی دەڵێ: دوای گەڕانم بەدوای موتابەعە و شایەتەکان بۆ فەرموودە زەعیفەکانی سنن الترمذي، توانیم بە سەدان فەرموودە لە زەعیفیەوە بەرز بکەمەوە بۆ حسن و صحیح.

ابن القيم لەباسی هەڵەی هەندێک لە فەرموودەناساندا دەڵێ:

ڕاوییەک دەبینێ تەوثیق کراوە و شایەتی ڕاستگۆیی و عەدالەتی بۆ دراوە یان فەرموودەیەکی لە صەحیحی بوخاری یان موسلیم دا هاتووە، وادەزانێ ئەم ڕاوییە هەر فەرموودەیەک ڕیوایەت بکات ئەوا لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیمە (چونکە ئەوان فەرموودەیەکی ئەویان ڕیوایەت کردووە).

ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایە، فەرموودە بەجۆرێک دەچێتە سەر مەرجی صەحیح گەر عیللەت و شذوذ و نەکارەی تێدانەبێت و موتابەعەی هەبێت، بەڵام بە هەبوونی ئەمانە یان یەکێک لەمانە، نابێتە صحیح وە لە سەر مەرجی صحیح نیە.

وە هەرکەسێک وورد ببێتە لە ووتەی البخاري و هاوشێوەکانی دەربارەی زەعیف دانانی فەرموودەی کەسانێک بەهۆی (علة)ەوە، کەچی البخاري فەرموودەی ئەم کەسانەشی هێناوە لە صەحیحەکەیدا، ئەوا ئەوکات ئیمامەتی و پلەو پایەی بوخاری دەزانێت لەم زانستەدا، وە ئەوەشی بۆ ڕوون دەبێتەوە کە باسمان کرد.

**(الفروسية المحمدية) لاپەڕە 181 - 182.**

بێگومانم لەوەی ئەوانەی دەمارگیرییان هەیە بۆ الألباني هەرگیز ئەوە قبوڵ ناکەن فەرموودەیەک الألباني بە حسن یان صحیحی دانابێت بڵێی زەعیفە، وە بەپێچەوانەوەش، گەرچی ئەم شتە بە زمانی قسەکردنیان نایڵێن بەڵام بە زمانی حاڵیان دەیڵێن، هەروەک عەرەب دەڵێ (لسان الحال أصدق من لسان المقال) واتا ئەوەی حاڵی کەسەکە پێتی دەڵێ ڕاسترە لەوەی کە زمانی کەسەکە پێتی دەڵێ.

کە الألباني دەڵێ: النووي والسيوطي وابن السكن و ابن حبان و أحمد شاكر ... هی تر شلن لە تصحیح کردندا، زانایانی تری فەرموودەناسیش بۆیان هەیە بڵێن الألباني شلە لە تصحیح و تحسین کردندا، بە شایەتی چەندین زانای فەرموودەناسی ئەم سەردەمە

کە هەندێک لەوانە خۆی قوتابی الألباني بووە دەڵێن: الألباني لە تصحيح و تحسين دا شل بووە.

بەتایبەتی ئەو فەرموودانەی کە زەعیفن و الألباني بەکۆی موتابەعە و شایەتەکان کردوویەنی بە صحیح یان حسن زۆربەی پشتی پێ نابەسترێ ئەو موتابەعە و شایەتانە هی ئەوە نین بتوانین پلەی فەرموودەکە بەرزبکەنەوە، وە ئەوەی الله تعالی بەصیرەتی پێدابێت لەم زانستەدا، بەراووردی حوکمی ئەلبانی بکات لەگەڵ زانایانی تردا ئەم شلیەی ئەلبانی بۆ دەردەکەوێ، بە تایبەتی لەو فەرموودانەی کە دەڵێ: صحيح لغيره یان حسن لغيره، (واتا ئەو فەرموودانەی زەعیفن بەڵام بە کۆی موتابەعە و شایەتەکان بوونەتە صحیح یان حسن).

وە فەرموودەی (ذات أنواط)یش یەکێکە لەو فەرموودانەی کە الألباني بەکۆی شایەتەکانی کردوویەتی بە صحیح.

بەڵام هەر ئەم زانایانەش دەڵێن: الألباني لە تضعيف کردندا زۆر باش بووە و زۆربەی جار پێکاویەتی.

ئەمەش قسەیەکی ڕاستە و ئینکاری ناکرێت کە زۆربەی ئەو فەرموودانەی ئەلبانی بە زەعیفی داناون پێکاویەتی ، **بەڵام:**

ئەمەش شتێکە هەردەبێ وابێ گومانی تێدانیە، چونکە هەر فەرموودەناسێک کە بە شلی ناسراوە لە تصحیح یان توثیق، کە فەرموودەیەک تضعیف دەکات یان ڕاوییەک جەرح دەکات زۆربەی کات دەیپێکێت، چونکە لەبەر شلیەکەی گەر فەرموودە یان ڕاوییەکە تۆزێک بواری ئەوەی تێدابووە قبوڵ بکرێ ئەوا قبوڵی دەکرد، کە قبوڵی نەکردووە واتا هیچ بوارێک نەبووە بۆ قبوڵ کردن

بەڵام ئەو کەسەی دەمارگیری بەرچاوی کوێر کردبێ ئەم ووتانە جگە لە توڕەکردنی و ئەستوربوونی دەمارگیرییەکەی زیاتر هیچی لێ ناکات.

لەکۆی ئەم شتانەی هێنامان بۆمان دەرکەوت کە ئەم فەرموودەیە شایەنی ئەوە نیە بکرێت بە حسن یان صحیح بەهۆی نەزاندراوی حاڵی (سنان) و نەبوونی موتابەعە بۆ فەرموودەکەی، وە دواتریش باسی دوو شایەتی فەرموودەکە دەکەین تا بزانین دەتوانن فەرموودەکە بکەن بە حسن یان صحیح.

**مەرجی سێیەم:** ضبط الرواة (توانای لەبەرکردنی ڕاویەکان).

ئەم مەرجەش تایبەتە بە سەنەد، کە ئایا ڕاویەکانی سەنەدە توانای لەبەرکردنیان چۆنە، بەهۆی نەزاندراوی حاڵی (سنان) هەروەک چۆن نەمانزانی لە مەرجی دووەم (سنان) جێگای متمانەیە و عادیلە، بە هەمان شێوە لەم مەرجەشدا نازانین (سنان) جێگای متمانەیە و لەبەرکردنی باشە، بە تایبەتی لە فەرموودەیەکی ئاوادا کە هیچ موتابەعەیەکی نیە، کەواتە هەر ڕاویەک حاڵی نەزاندراو بێ ئەوا مەرجی دووەمی سێیەمی لێ نایەتە دی، ئەمەش هۆکارە کە فەرموودەکە قبوڵ نەکرێ، بۆیە پێویست ناکات هەمان ووتەکانی مەرجی دووەم باس بکەینەوە.

**مەرجی چوارەم:** عدم الشذوذ (نەبوونی شاز لە سەنەد و مەتنی فەرموودەدا).

لە پێشوودا باسی (شاذ)مان کرد کە بە مانای چی دێت لە زاراوەی فەرموودەناسیدا، کە نابێت کەسێکی جێگای متمانەیە لەڕووی عەدالەت و لەبەرکردنەوە پێچەوانەی کەسێک یان کۆمەڵێک بکات کە لەخۆی زیاتر جێگایەی متمانەن، وە نابێت کەسێک کە شایەنی ئەوە نیە (تفرد) بکات بە تەنها فەرموودەیەک ڕیوایەت بکات لە کەسێکەوە کە هیچ ڕاویەکی تر ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت نەکردبێ لەم کەسەوە، بەڵام گەر کەسەکە شایەنی (تفرد) بوو ئەوا نابێتە (شاذ) و قبوڵ دەکرێ، وەکو (تفرد)ی الزهري لە أنس رضي الله عنه.

لە فەرموودەی (ذات أنواط)یش دا دەبینین سنان (تفرد)ی کردووە لە ڕیوایەتکردنی ئەم فەرموودەیە لە أبي واقد الليثي، (سنان)یش بەهۆی نەزانینی حاڵەکەی شایەنی ئەوە نیە (تفرد) بکات و فەرموودەکە دەبێتە شاذ و قبوڵ ناکرێ.

**مەرجی پێنجەم:** عدم العلة (نەبوونی علة لە سەنەد و مەتنی فەرموودەدا).

**عیللەت** : شتێکی شاراوایە صەحیحی فەرموودە عەیبدار دەکات لەکاتێکدا ڕووکەشی فەرموودەکە وا دەردەکەوێ کە سەلامەتە.

ئەو شتانەی کە فەرموودەی پێ زەعیف دەبێت وەکو پچڕانی سەنەد و نەبوونی عەدالەت و لەبەرکردن بە عیللەت داناندرێن، چونکە ئەمانە ئاشکران بەڵام عیللەت

شاراوەیە، دۆزینەوەی عیللەتیش بەهۆی کۆکردنەوەی هەموو سەنەدەکانی فەرموودەکە دەبێت.
ئەم فەرموودەیەش عیللەت لە سەنەد و مەتنیدا هەیە، عیللەتی سەنەدەکە ئەوەیە کە پچڕانی تێدایە بەڵام ڕووکەشی سەنەدەکە وادیارە بەیەک گەیەندراوە (متصل)ە، هەروەک ووتمان عیللەت شتی شاراوەیە، بەڵام دوای ئەو لێکۆڵینەوانەی پێشوو بۆمان دەرکەوت (سنان) گوێ بیستی فەرموودە نەبووە لە (أبي واقد).

عیللەتی مەتنەکەش واتا (دەقی فەرموودەکە) پەیوەندی بە هاوەڵی بەڕێز (أبي واقد الليثي)ەوە هەیە رضي الله عنه.
سەرەتا ئەوە بزانین کە ناوی هاوەڵەکە خیلافی لەسەرە کە ناوەکەی بە سێ ناو هاتووە لە کتێبەکاندا، ئەوانیش (الحارث بن عوف – عوف بن الحارث – الحارث بن مالك) هەرچەندە هەر کامێک لەمانە ناوی ڕاستەقینەی (أبي واقد) بێ پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە بابەتەکەمان نیە، تەنها ئەوە نەبێت کە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە لە ڕیوایەتی (ابن إسحاق) لە سیرەدا وادەردەکەوێ کە أبي واقد و الحارث بن مالك دوو کەسی جیان، بەڵام لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ڕیوایەتەکەی ابن إسحاق هەڵەیە بەڵکو أبي واقد ناوی الحارث بن مالك ە هەردووکیان یەک کەسن، هەروەک لە ڕیوایەتی دووەمی (الواقدي)دا دەردەکەوێ کە هەردووکیان یەک کەسن.
بێینە سەر عیللەتی فەرموودەکە لەڕووی مەتنەوە، کە ووتمان پەیوەندی بە (أبي واقد)ەوە هەیە، هەروەک بینیمان أبي واقد لە ناوەکەیدا خیلاف هەیە، بەهەمان شێوە لە ساڵی لە دایکبوون و وەفاتکردن و موسڵمان بوون و بەشداریکردنی لە جەنگی بەدردا خیلاف هەیە، هەندێک لە زانایان دەڵێن (أبي واقد) لە جەنگی بەدردا بەشداری کردووە، کەواتە لە ساڵی دووەمی کۆچی موسڵمان بووە لەوانەشە پێش ئەوکاتیش موسڵمان بووبێ، گەر ئەمە ڕاست بێ ئەی چۆن (أبي واقد) لەم فەرموودەیەدا دەڵێ: ئێمە لە فەتحی مەککە موسڵمان بووین ؟ وە هەندێکیان دەڵێن (أبي واقد) لە جەنگی بەدردا بەشدار نەبووە بەڵام پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە، ئەمەش گەر ڕاست بێ دووبارە فەرموودەکە دەخاتەوە ژێر پرسیار ، وە هەندێکیان دەڵێن: (أبي واقد) لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە، ئەوانەی کە ئەم ڕایەیان هەیە تەنها لەبەر فەرموودەی (ذات أنواط)ە وادەڵێن و فەرموودەکەیان کردۆتە بەڵگە، بەڵام ئەوانەی

که دەڵێن بەشداری جەنگی بەدری کردووە ئاگاداری ئەم فەرموودەیەن کەچی ئینجا دەڵێن لە جەنگی بەدردا بەشدار بووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو زانایانە فەرموودەی (ذات أنواط)یان پێ زەعیف بووە، ئەگینا چۆن فەرموودەکە دەڵێ لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووم واتا ساڵی هەشتەم، ئەوانیش دەڵێن بەشداری بەدری کردووە واتا ساڵی دووەم.

زانایان خیلافیان هەیە لەساڵی مردنی و تەمەنی لەکاتی مردندا بەم شێوەیە:

نێوان ساڵانی ٤٠ بۆ ٥٠ کۆچی مردووە

ساڵی ٦٥ کۆچی مردووە

ساڵی ٦٨  کۆچی مردووە

لە تەمەنی ٦٠ ساڵی مردووە

لە تەمەنی ٦٥ ساڵی مردووە

لە تەمەنی ٧٠ ساڵی مردووە

لە تەمەنی ٧٥ ساڵی مردووە

لە تەمەنی ٨٥ ساڵی مردووە

ئەم ڕەئیانە هەریەکەیان ژمارەیەک زانا خاوەنیەتی، بەڵام کەسیان بەڵگەیەکی بەهێزی پێ نیە بۆ سەلماندنی ساڵی مردنی و تەمەنی لەکاتی مردندا.

سەبارەت بە ساڵی موسڵمان بوونی و بەشداری کردن و نەکردنی لە جەنگی بەدردا بە هەمان شێوە خیلاف هەیە ئەویش بەم شێوەیە:

بوخاری و ابن حبان و أبو أحمد و ابن عبد البر دەڵێن: بەشداری بەدری کردووە.

ابن سعد دەڵێ: لە کۆندا موسڵمان بووە و هەڵگری ئاڵا بووە لە فەتحی مەککەدا.

أبو الحجاج المزي دەڵێ: بەشداریکردنی لە بەدردا جێگای گومانە.

الذهبي و ابن حجر و أبو نعيم دەڵێن: بەشداری بەدری نەکردووە، بەڵگەکەیان فەرموودەی (ذات أنواط)ە، دەڵێن أبي واقد خۆی ووتویەتی لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووم، کەواتە بەشداری بەدری نەکردووە.

ابن إسحاق لە سیرەدا ڕیوایەتێکی هێناوە کە أبي واقد لە بەدردا بەشدار بووە.

الذهبي دەڵێ: لەوانەیە دوو هاوەڵ هەبووبن بەم ناوەوە، یەکێکیان لە بەدردا بەشدار بووە ئەوی تریان لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە. (دیارە الذهبي ڕوایەتی ذات أنواط و ڕیویەتی ابن إسحاق هەردووک بە صحیح زانیوە بۆیە وادەڵێ).
ئەمەش هەڵەیە چونکە ڕیوایەتەکەی ابن إسحاق زەعیفە، وە هەر یەک أبي واقد هەیە.

**منیش دەڵێم:** دوای زانینی زەعیفی فەرموودەکە لە چەند ڕووێکەوە ئەوکات ئەم بەڵگە و گومانانە پوچەڵ دەبێتەوە.

بەڵگەیەکی تر کە ئەوە دەگەیەنێت (أبي واقد) لە هاوەڵە کۆنەکانە و لەپێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە، ئەویش فەرموودەیەکی صەحیحی موسلیمە:

صحيح مسلم – **2096 :** حدثنا يحيى بن يحيى قال قرأت على مالك عن ضمرة بن سعيد المازني عن عبيد الله بن عبد الله أن عمر بن الخطاب سأل أبا واقد الليثي ما كان يقرأ به رسول الله صلى الله عليه وسلم في الأضحى والفطر؟ فقال: كان يقرأ فيهما بـ (ق والقرآن المجيف) و (اقتربت الساعة وانشق القمر).

صحيح مسلم – **2097 :** وحدثنا إسحاق بن إبراهيم أخبرنا أبو عامر العقدي حدثنا فليح عن ضمرة بن سعيد عن عبيد الله بن عبد الله بن عتبة عن أبي واقد الليثي قال: سألني عمر بن الخطاب عما قرأ به رسول الله صلى الله عليه وسلم في يوم العيد فقلت بـ (اقتربت الساعة) و (ق والقرآن المجيد).

یەک فەرموودەیە بەڵام بە دوو سەنەدی جیا، مانای فەرموودەکەش ئەمەیە:
عمر بن الخطاب ڕەزای خوای لێبێت پرسیاری لە أبي واقد الليثي کردووە ڕەزای خوای لێبێت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا چ سورەتێکی دەخوێند، أبي واقد الليثي ش لە وەڵامدا دەڵێ: سورەتی (ق و القمر).
جا ئەگەر أبي واقد الليثي لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووبێت بۆچی ئیمامی عمر پرسیار لە هاوەڵێکی کۆن ناکات بۆچی پرسیار لە هاوەڵێک دەکات کە لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە، ئەمە لەکاتێکدا ئیمامی عمر خۆشی لە هاوەڵە کۆنەکانە، بەڵام دیارە ئەمەی بیرچووە یان لە جەژنەکاندا لەناو شار نەبووە بۆیە نازانێت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چی خوێندەوە لە نوێژی جەژندا، وە پرسیارکردنی عمر

له أبي واقد، ئەوە دەگەیەنێت کە أبي واقد هاوەڵێکی کۆن بووە، وە ئیمامی عمر یش بەوە ناسراوە لەکاتی پرسیار و شوڕاکردنیدا هاوەڵانی بەدری کۆ دەکردەوە.

بەکۆی ئەم هەموو شتەی باسمان کرد فەرموودەی (ذات أنواط) بە سەنەدی (سنان بن أبي سنان) لە پێنج مەرجەکەی فەرموودەی صەحیحدا لە هیچیان بە سەلامەتی دەرناچێت، بەهۆی نەبیستنی سنان لە أبي واقد و نەزاندراوی حاڵی سنان و تفرد کردنی لە ڕیوایەتکردنی ئەم فەرموودەیە لە أبي واقد ەوە، وە هەروەها عیللەتی مەتنەکەشی کە تازە باسمان کرد، ئێستاش دێینە سەر دوو سەنەدەکەی تری ئەم فەرموودەیە کە دوو هاوەڵی جیاوازی تێدایە لە أبي واقد ئەوانیش (عمرو بن عوف و ابن عباس)ن رضي الله عنهما، ئایا بزانین ئەم سێ سەنەدە دەتوانن ببن بە شایەت بۆ یەکتری و پلەی فەرموودەکە بەرز بکەنەوە بۆ حسن یان صحیح ؟

**تێبینی:** إبن القیم رحمه الله لە کتێبی (إغاثة اللهفان - بەرگی 1 - لاپەڕە 371) فەرموودەی (ذات أنواط)ی هێناوە لە ڕیوایەتی أبي واقد اللیثي، دەڵێ بوخاری ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەتکردووە لە صەحیحەکەیدا !!!
ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکراو ڕوونە، بەڵام هیچ کەسێک و زانایەکیش بەدەر نابێت لە هەڵە، بە تایبەتی هەڵەی زاکیرە.
وە هەروەها الشیخ محمد بن عبدالوهاب (رحمه الله) کەوتۆتە ناو هەمان هەڵەوە، وایزانیوە بوخاری ڕیوایەتی کردووە، هەروەک لە نامەکانیدا هاتووە. (الرسائل الشخصیة - لاپەڕە 70)

# شیكردنەوەی سەنەدی دووەم

## (عن كثير بن عبد الله بن عمرو بن عوف المزني عن أبيه عن جده)

عمرو بن عوف المزني هاوەڵ بووە (رضي الله عنه)، ئەم فەرموودەیە (كثير) دەیگێڕێتەوە لە (عبد الله)ی باوكی، وە باوكیشی دەیگێڕێتەوە لە (عمرو)ی باپیریەوە.

كەواتە عن أبيه : واتا عبد الله باوكی كثير

وە عن جده : واتا عمرو باپیری كثير

مادام جگە لە أبي واقد الليثي هاوەڵێكی تریش ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەتكردووە، ئەوا سەیر دەكەین بزانین ئەم ڕیوایەتە دەتوانێت ببێتە شایەت بۆ ڕیوایەتەكەی أبي واقد یان نا ؟ چونكە هەروەک ووتمان هەموو ڕیوایەتێک شایەنی ئەوە نیە پشتی پێ ببەسترێ وەكو (الشواهد و المتابعات) تەنها مەگەر ڕیوایەتەكە خۆی بەهێز بێت و جێگای متمانە بێ ئینجا بتوانێ ببێتە شایەت یان موتابع بۆ ڕیوایەتی ترو بەهێزی بكات.

لەپێشوودا ئاماژەیەكی كورتمان بەم ڕیوایەتەدا لە ووتەكانی (إبن القيم – الفروسية المحمدية)، ئێستاش ڕوونتر باسی ڕیوایەتەكە دەكەین.

ئەم ڕیوایەتە لە كتێبی (تفسير ابن أبي حاتم) و (المعجم الكبيرى الطبراني)دا هاتووە،

(ابن أبي حاتم) لە أبو حاتم ی باوكیەوە ڕیوایەت دەكات ئەویش لە إبراهيم بن المنذر ئەویش لە ابن أبي فديك ئەویش لە كثير ئەویش لە باوكیەوە ئەویش لە باپیری كثيرەوە.

(الطبراني)ش لە مسعدة بن سعد العطار ڕیوایەت دەكات ئەویش بە هەمان شێوە لە إبراهيم بن المنذر و ابن أبي فديك و كثير و باوک و باپیریەوە ڕیوایەت دەكات.

هەروەک لە پێشوودا هەردووک سەنەدەكەمان نوسیوە بە ژمارەوە.

كەواتە هەردوو سەنەدەكە هەمان ڕاویەكانیان تێدایە تەنها یەک ڕاویان جیاوازە ئەویش أبو حاتم ە لە سەنەدی ابن أبي حاتم

وە مسعدة بن سعد العطار ە لە سەنەدی الطبراني

ڕاویەكانی تر هەمان ڕاوین لە هەردوو سەنەد دا.

ئەگەرچی هەر یەكە لە مسعدة بن سعد العطار و ابن أبي فديك قسەیان لەسەرە زۆر تا كەم، بەڵام ئێمە بە گریمانە وا دادەنێین كە هەردووكیان جێگای متمانەن و كێشەیان نیە، چونكە قسەی ئێمە لەسەر كثير و عبد الله ی باوكیەتی.

ووتەی زانایانی جەرح و تەعدیل دەربارەی کثیر:

یحیی بن معین وتوویەتی: فەرموودەکانی هیچ نین و نانوسرێنەوە.

أبو زرعة الرازي وتوویەتی: فەرموودەکانی لاوازە، بەهێز نیە (لیس بقوي)

لە دەستەواژەی زانایانی جەرح و تەعدیل دا (لیس بقوي و لیس بالقوي) دوو حوکمی جیاوازیان هەیە (لیس بقوي) واتا لە ئەصلدا بەهێز نیە (نفي لأصل القوة)، بەڵام (لیس بالقوي) واتا بەهێزیەکەی ئەوتۆ نیە (نفي لکمال القوة).

أبو حاتم الرازي وتوویەتی: بەهێز نیە

النسائي والدارقطني وتوویانە : واز لە فەرموودەکانی هێنراوە (متروك الحديث).

الشافعي ووتویەتی: ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی درۆ.

أحمد بن حنبل وتوویەتی: فەرموودەکانی مونکەڕە، هیچ نیە.

أبو خيثمة دەڵێ أحمد بن حنبل پێی ووتم : هیچ شتێک لە کثیر ڕیوایەت مەکە.

أبو داود وتوویەتی: یەکێکە لە درۆزنەکان

ابن حبان وتوویەتی: کثیر لە باوک و باپیریەوە ڕیوایەت دەکات، ئەم سەنەدەش نوسخەیەکی هەڵبەستراوە، حەڵاڵ نیە باسبکرێ لە کتێبەکان و ڕیوایەتەکاندا تەنها بۆ سەرسام بوون نەبێت.

دوای حوکمی ئەم زانایانە بۆمان دەرکەوت کە ئەم ڕیوایەتە زۆر زەعیفە (ضعيف جدا) چونکە کثیر (متروك)ە، ڕاوی مەتروکیش لەهەر سەنەدێکدا هەبێت دەیکاتە بە (ضعيف جدا)، وە ئەگەر تۆزێک لەم حوکمەش تەنازول بکەین بڵێین مەتروک نیە بەڵکو تەنها زەعیفە، ئەوا بە هەمان شێوە سەنەدەکە دەبێتە زەعیف، بە کەڵکی ئەوە نایەت ببێتە شایەت بۆ سەنەدەکەی (سنان) چونکە خۆی حاڵی لە سنان زۆر خراپترە.

# شیکردنەوەی سەنەدی سێیەم

## (عن الواقدي عن ابن أبي حبيبة عن داود بن الحصين عن عكرمة)

ئەم سەنەدەش تەنها (الواقدي له المغازي) وه (الأزرقي له أخبار مكة) ڕیوایەتیان کردووه هەروەک له پێشوودا هەردووک سەنەدەکەمان هێناوه به ژمارەوه، (الأزرقي)ش هەر له (الواقدي)ەوه ڕیوایەتی کردووه واتا هەردووک سەنەده هەمان ئەم ڕاوییانەی تێدایه (الواقدي و ابن أبي حبيبة و داود بن الحصين و عكرمة) وه (عكرمة)ش له (ابن عباس)ەوه ڕیوایەتی کردووه رضي الله عنه.

الواقدي و ابن أبي حبيبة و داود بن الحصين هەرسێکیان قسەیان لەسەره.

**الواقدي** : سەرەڕای ئەوەی زانایەکی گەورەیه و زانستێکی زۆری هەیه به تایبەتی له (سیره و غەزەواتەکان) بەڵام له فەرمووده حاڵی زۆر خراپه زۆرینەی زانایان وازیان له فەرموودەکانی هێناوه.

الذهبي دەڵێ: الواقدي عەللامەیه، زانایان یەکدەنگن لەسەر زەعیفیەکەی، بەڵام سەرەڕای ئەوەش بێ نیاز نین له الواقدي دەربارەی غەزاکان و مێژووی هاوەڵان.

البخاري دەربارەی دەڵێ: سكتوا عنه (واتا لێی بێدەنگ بوونه).

الذهبي دەربارەی ئەم حوکمەی البخاري دەڵێ: ووتەکە وا دەردەکەوێ که بێدەنگ بوونه لەسەری نه جەرحیان کردووه نه تەعدیل، بەڵام دوای تێڕامان و ووردبوونەوه لەم حوکمەی بوخاری بۆمان دەرکەوت که مەبەستی بوخاری له (سكتوا عنه واتا تركوه) واتا (متروك الحديث)ە، وازهێنراوه له فەرموودەکانی، بوخاریش بەمە ناسراوه که له نه له جەرح کردندا نه له تەعدیل کردندا زیادەڕەوی ناکات بەڵکو ووشەیەکی ساده بەکاردەهێنێ، ئەمەش ئەوپەڕی وەرعە که بوخاری هەیەتی.

مسلم دەڵێ: متروك الحديث.

النسائي دەڵێ: جێگای متمانه نیه (ليس بثقة).

أبو زرعة الرازي دەڵێ: خەڵکی وازیان له فەرموودەکانی الواقدي هێناوه.

الذهبي دەڵێ: الواقدي هیچ فەرموودەیەكی نیە لە شەش كتێبەكە (الصحیحین و چوار سونەنەكە) تەنها یەک فەرموودە نەبێت كە (ابن ماجه) ڕیوایەتی كردووە بەم شێوەیە حدثنا ابن أبي شیبة حدثنا شیخ لنا .....

ابن ماجه جورئەتی نەكردووە بڵێ الواقدي بەڵكو وتوویەتی شێخێک بە نەناسراوی ناوی هێناوە، ئەمەش لەبەر لاوازی حاڵی الواقدي لەلای زانایان.

ئەمە حاڵی واقدییە كە زانیمان، سەرەڕای ئەو ابن أبي حبیبة و داود بن الحصین حاڵیان باش نیە كە ئێستا دێینە سەری.

**ابن أبي حبیبة :**

البخاري دەربارەی دەڵێ: منكر الحدیث .

بوخاری خۆی دەڵێ گەر دەربارەی ڕاوییەک ووتم (منكر الحدیث) حەڵاڵ نیە فەرموودەی لێ بگێڕدرێتەوە.

النسائي دەڵێ: زەعیف.

الدارقطني دەڵێ: متروك الحدیث.

أبو حاتم الرازي دەڵێ: بەهێز نیە، فەرموودەكانی دەنوسرێتەوە و پشتی پێ نابەسترێ، فەرموودەكانی مونكەرە.

ابن عدي دەڵێ: فەرموودەكانی دەنوسرێتەوە سەرەڕای زەعیفیەكەی.

كۆی ئەم ووتانەش ئەوە دەگەیەنێت كە جگە لە الواقدي، ابن أبي حبیبة ش زەعیفە و پشتی پێ نابەسترێ، ئەمە لە كاتێكدا تەنها هەبوونی الواقدي لە سەنەدەكەدا بەسە بۆ بە زەعیف دانانی ڕیوایەتەكە، بەڵام دەمانەوێ زیاتر زەعیفی ڕیوایەتەكە دەربخەین.

**داود بن الحصین :**

علي بن المدیني دەڵێ: ئەوەی داود لە عكرمة ەوە ڕیوایەتی دەكات مونكەرە.

ابن حجر العسقلاني دەڵێ: داود جێگای متمانەیە تەنها لە ڕیوایەتی عكرمة دا نەبێت.

أحمد بن حنبل و ابن تیمیة و ابن القیم : ڕیوایەتی (داود عن عكرمة)یان قبوڵ كردووە و بە صەحیحیان داناوە.

أبو داود دەڵێ: ڕیوایەتەکانی داود لە عکرمة ەوە مونکەرە.

الترمذي ش قسەی کردووە لەسەر توانای لەبەرکردنی داود.

بەکۆی ئەم هەموو ووتانەی دەربارەی الواقدي و ابن أبي حبيبة و داود بن الحصين بۆمان دەردەکەوێ ئەم سەنەدەش حاڵی خراپترە لە دوو سەنەدەکەی پێشووی (سنان و كثير) چ جای ئەوەی ببن بە شایەت بۆ یەکتری و یەکتری بەهێز بکەن، وە سەرەڕای زەعیفی سەنەدەکان مەتنی فەرموودەکەش عیللەتی تێدایە هەروەک لە پێشوودا باسمان کرد، بەمەش بۆمان دەردەکەوێت ئەم فەرموودەیە (ذات أنواط) فەرموودەیەکی زەعیفە و شایەنی ئەوە نیە بە بەڵگە بهێندرێتەوە بۆ بابەتی عوزر بە جەهل لە تەوحید دا، وە ئەگەر ئەوانەی ئینکاری دەکەن و هەر دەڵێن صەحیحە، ئێمەش دەڵێین گریمان با صەحیحیش بێت کە وانیە، زانایان بەم شێوەیە لە فەرموودەکە تێنەگەیشتوون کە ئێوە لێی تێگەیشتوون و کردووتانە بە قەڵغان بۆ خۆتان لە بابەتی عوزر بە جەهل لە تەوحید دا، هەرکەسێک تەوحیدی هەڵوەشاندەوە دەست بەجێ ئەم فەرموودەیەی بۆ دەهێننەوە وەکو عوزر، بۆیە ئێمەش لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ووتەی زانایان نەقل دەکەین دەربارەی تێگەیشتنیان بۆ ئەم فەرموودەیە و شیکردنەوەی.

# بەشی دووەم

# لێکدانەوەی مانای فەرموودەکە

**ابن تيمية - رحمه الله دەڵێ:**

کاتێک موشریکەکان دارێکیان هەبوو چەکەکانیان پێوە هەڵدەواسی ناویان نابوو (ذات أنواط) هەندێک خەڵک ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ ئێمەش (ذات أنواط) دابنێ هەروەک چۆن ئەوان (ذات أنواط)یان هەیە، فەرمووی: الله أكبر، هەمان ئەو شتەتان ووت کە قەومی موسا ووتیان: (اجعل لنا إلها كما لهم آلهة) خوایەکمان بۆ دابنێ هەروەک چۆن ئەم قەومە خوایەکیان هەیە، ئەمە ڕێبازی ئوممەتانی پێشووە، شوێنی ڕێبازی ئوممەتانی پێش خۆتان دەکەون.

جا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئینکاری ئەم شتەی لێکردن کە تەنها خۆچواندنیان بوو بە کافران لە دانانی دارێک بۆ ئیعتیکاف کردن لە دەوری و هەڵواسینی چەکەکانیان پێیەوە، جا گەر شتێک لەم خۆچواندنەیان بە موشریکان گەورەتر بێت یان خودی شیرك بێت، ئەوکات دەبێت چۆن پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئینکارییان لەسەر بکات ؟.

**(إقتضاء الصراط المستقيم - لاپەڕە 649)**

لە ووتەکانیدا ڕوونە کە ئەم داوایەی هاوەڵانی بە کوفر نەزانیوە بۆیە دەڵێ: گەر شتێکی گەورەتر لەمەیان داوا کردبوایە یان خودی شیرکیان ئەنجام دابوایە، ئەوکات دەبوایە چۆن پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئینکاری لەسەر بکات.

**الشاطبي - رحمه الله دەڵێ:**

دانانی (ذات أنواط) لە دانانی پەرستراوێک دەچێ کە بپەرسترێ جگە لە الله، بەڵام نەوەک خودی ئەم شتە بێ. (واتا تەشبیهە نەوەک خودی کارەکە بێ).

**(الإعتصام - بەرگی 2 - لاپەڕە 245)**

### الشوكاني - رحمه الله دەڵێ:

مەبەستی هاوەڵان ئەوە نەبوو کە دارەکە بپەرستن یان داوای ئەو شتانەی لێ بکەن کە گۆڕپەرستان داوا لە خاوەنی گۆڕەکان دەکەن، جا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی ڕاگەیاندن کە ئەم کارەیان وەکو شیرکێکی ئاشکرا وایە، وەکو ئەوە وایە داوای پەرستراوێک بکەی جگە لە الله.

**(الدر النضيد في إخلاص كلمة التوحيد - لاپەڕە 36)**

### ابن القيم - رحمه الله دەڵێ:

لێکچوونی شتێک بە شتێک مەرج نیە هەموو حوکمەکانی شتەکە وەربگرێت.

**(الداء والدواء - لاپەڕە 181)**

### محمد بن عبد الوهاب - رحمه الله دەڵێ:

موشریکەکان شوبهەیەکیان هەیەدەیکەن بە بەڵگە لەم چیرۆکەدا (چیرۆکی ذات أنواط) ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن: نەوەی ئیسرائیل بەم ووتەیان کافر نەبوو، بە هەمان شێوە ئەوانەی بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم یان ووت (ذات أنواط)مان بۆ دابنێ کافر نەبوون.

لە وەڵامدا دەڵێین: نەوەی ئیسرائیل ئەم کارەیان نەکرد، بە هەمان شێوە ئەوانەی داوایان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەم کارەیان نەکرد، وە خیلاف لەوە دانیە گەر نەوەی ئیسرائیل ئەم کارەیان کردبوایە کافر دەبوون، وە خیلاف لەوە دانیە کە ئەوانەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی لێکردن گەر گوێڕایەڵیان نەکردبوایە و (ذات أنواط)یان دانابوایە پاش نەهی کردنەکەی ئەوا کافر دەبوون.

بەڵام ئەم چیرۆکە سوودێکی تێدایە ئەویش ئەوەیە کە موسڵمان بەڵکو زاناش دەکەوێتە ناو شیرکەوە بەبێ ئەوەی بزانێت.

جا سوودی ئەوەی تێدایە کە پێویستە خۆمان فێرە عیلم بکەین و خۆمان بپارێزین لەم شتانە، وە بەهۆی ئەم چیرۆکەوە زانیمان کە کەسێکی جاهیل دەڵێ: (لە تەوحید تێگەیشتووین) ئەم ووتەیە گەورەترین جەهلە و فێڵی شەیطانە.

**(كشف الشبهات - لاپەڕە 56 - 57)**

**محمد بن إبراهيم آل الشيخ - له شەرحی ئەم ووتانەی سەرەوەدا دەڵێ:**

له وەڵامدا دەڵێین: نەوەی ئیسرائیل کارەکەیان ئەنجام نەدا بۆیە کافر نەبوون، نەوەک لەبەر ئەوەی کارەکەیان کوفر نیە، بە هەمان شێوە ئەوانەی داوایان لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کارەکەیان ئەنجام نەدا، بەڵکو شتێکیان بە باش زانی و داوایان کرد، گەر ئیعتیکافیان کردبوایە لەسەر گۆڕەکاندا یان پەرستراوێکی تریان بپەرستبوایە ئەوا کافر دەبوون، ئەمە شتێکە کە کەس تیایدا خیلافی نیە، وە شوێنکەوتنی پێغەمبەر و کارە چاکەکانی تریان سوودی پێ نەدەگەیاندن، جا کافر نەبوونیان ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کارەکەیان ناگاتە پلەی تەکفیرکردن، واتا ئێمە کارەکە دەکەین بە بەڵگە، گەر کرابوایە ئەوا کوفر بوو، جا بەڵگە هێنانەوەکەمان لە شوێنی خۆیدایە، بەڵام ئەوان کارەکەیان ئەنجام نەدا گەر ئەنجامیان دابوایە ئەوا کوفر بوو، جا بۆ ئێمە ڕەوایە هەردووک چیرۆکەکە بکەینە بەڵگە بەسەرتانەوە (واتا چیرۆکی نەوەی ئیسرائیل و هاوەڵان)، ووتەی کەسی جاهیل کە دەڵێ: (لە تەوحید تێگەیشتووین) گەورەترین جەهلە و فێڵی شەیطانە، مەبەستی (شێخ محمد بن عبد الوهاب) ئەوەیە کە هەندێک قوتابی چەند کتێبێک و بابەتێکی تەوحید دەخوێنن دواتر دەڵێن: لە تەوحید گەیشتین، لە مەودوا بابەتی تر دەخوێنین جگە لە تەوحید، (شێخ محمد)یش بەم چیرۆکە وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ: ئەوەتا ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر موسا و محمد بوون علیهما الصلاة والسلام زۆر لە ئێوە زاناتر و تێگەیشتووتر بوون کەچی کەوتنە ئەم هەڵەیە، ئەی ئێوە چۆن دەڵێن ئێمە لە تەوحید گەیشتووین و با شتی تر بخوێنین. **(شرح كشف الشبهات - بەرگی 1 - لاپەڕە 134 - 137) بتصرف.**

**محمد بن عبد الوهاب - رحمه الله دوای هێنانی فەرموودەکە و باسکردنی دەڵێ:**

ئەم فەرموودەیە چەند بابەتێکی تێدایە:

سێیەم : کارەکەیان ئەنجام نەدا.

یانزدەیەم : شیرك گەورە و بچووکی هەیە، چونکە هاوەڵان بەم ووتەیان مورتەد نەبوونەوە.

چواردەیەم : داخستنی هۆکارەکانی توشبوون بە شیرك و کوفر.

**(كتاب التوحيد - باب من تبرك بشجر أو حجر ونحوهما)**

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (شێخ محمد بن عبد الوهاب) ئەم ووتەیەی هاوەڵانی بە شیرکی گەورە نەزانیوە، وە نەیفەرمووە شیرکی گەورەیە بەڵام لەبەر تازە موسڵمان بوونەکەیان عوزریان هەیە بە جەهل و کافر نابن.

وەکو بینیمان هیچ یەکێک لەم زانایانە نەیفەرمووە ووتەکەی هاوەڵان شیرکی گەورە بووە بەڵام لەبەر تازە موسڵمان بوونیان عوزریان هەبووە بە جەهل بۆیە کافر نەکران لەلایەن پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، بەڵکو هەموویان دەڵێن ئەو کارەی ئەوان خۆچواندن بوو بە موشریکان نەوەک خودی کارەکەیان، ئەمەش لەکاتێکدایە پێشتر ڕوونمان کردەوە کە فەرموودەکە زەعیفە لەڕووی سەنەد و مەتنەوە، ناکرێ بەڵگەی پێ بهێندرێتەوە بەتایبەتی لە بابەتێکی عەقیدەیی وا گرینگدا، سەرەڕای ئەمانەش بەڵگە هێنانەوەی جەهمی و مورجیئە بەم فەرموودەیە نابێتە بەڵگە بەسەرمانەوە چونکە لەڕووی فەرموودەناسیەوە کێشەی لەسەرە فەرموودەکە، وە لەڕووی لێکدانەوەی ماناکەشی کێشەی لەسەرە، هەرچەندە زانایانی سەلەف تاوەکو دەگاتە شێخ محمد بن عبد الوهاب و نەوەکانی کێشە و خیلافیان نەبووە لە مانای فەرموودەکە بەڵام هەندێک زانای جەهمی و مورجیئەی ئەم سەردەمە کە ناویان لە تەکفیر ناوە (فیتنە) و چەندەها کتێبیان نوسیوە لەسەری بە ناونیشانی (فتنة التكفير) ئەم فەرموودەیە هەمیشە دەهێننەوە بە بەڵگە بۆ بابەتی عوزر بە جەهل لە تەوحید.

سەرەڕای ئەمانەش با تەنازول بکەین و وایدابنێین کە ئەم فەرموودەیە هەم لەڕووی سەنەد و مەتنەوە خیلافی لەسەرە، وە هەم لەڕووی لێکدانەوەی ماناکەی خیلافی لەسەرە، چونکە هەندێک زانا بە صەحیحی دەزانن و دەیکەن بە بەڵگە بۆ هەبوونی عوزر بە جەهل لە تەوحید دا، فەرموون ووتەی هەندێک لە زانایان ببینن لەو بابەتانەی کە ئەگەری هەیە چەند ڕووێک بگرێتە خۆ، وە خیلافی لەسەرە لە چەند ڕووێکەوە :

لە (أصول الفقه)دا قاعیدەیەک هەیە دەڵێ:

**(ما تطرق إليه الإحتمال بطل به الإستدلال)**

واتا : هەرشتێک چەند ئەگەرێک لەخۆ بگرێت ئەوا بەڵگە پێ هێنانەوەی پوچەڵە.

**تێبینی:** بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین کە هەر قاعیدەیەک زانایان دایان ناوە کۆمەڵێک مەرج و ڕێکخستنی هەیە، واتا هەموو قاعیدەیەک بە ڕەهایی (مطلق)ی باس ناکرێت، گەر وابێت ئەوا ئەم هەموو لایەنێک ئەم قاعیدەیە و هاوشێوەکانی دەکاتە بەڵگە بۆ بڵاوکردنەوەی گومانەکانی و ڕەتکردنەوەی بەڵگە ڕاستەکان، بۆیە بەکارهێنانی ئەم قاعیدەیە بە ڕەهایی دوور نیە خاوەنەکەی بەرەو کوفر ببات.

مەبەست لەم قاعیدەیە ئەوەیە کە هەرشتێک ئەگەری ئەوە هەبوو صەحیح بێت یان ضعیف، یان ئەگەری ئەوە هەبوو چەند مانایەک لەخۆ بگرێت، ئەوا بەڵگە پێ هێنانەوە بەم شتە پوچەڵە (باطل)ە، وە ئەگەر کەسێک وەکو بەڵگە بەکاری بهێنێت بۆی نیە بیکاتە بەڵگە بەسەر موخالیفەکانیدا.

**ابن تيمية دەڵێ:** گەر بەڵگە ئەگەری لەخۆ گرت، بۆ بەڵگە هێنانەوە نابێت.

**(مجموع الفتاوى - بەرگی 2 - لاپەڕە 121)**

**الشاطبي دەڵێ:** زانایان ئەوە دەزانن کە هەر بەڵگەیەک گومان و کێشەی تێدا بوو ئەوا بەڵگە نیە لە ڕاستیدا، تاوەکو مانا و مەبەست تیایدا ڕوون دەبێتەوە، وە مەرجیشە کە هیچ ئەصڵێکی ڕوون و چەسپاو پێچەوانەی نەبێت، جا گەر ماناکەی بە ڕوونی دەرنەکەوت بەهۆی موجمەلی یان بەهۆی چەند ئەگەرێک تیایدا یان ئەصڵێکی بێگومان و چەسپاو پێچەوانەی بوو، ئەوا نابێتە بەڵگە، چونکە حەقیقەتی بەڵگە ئەوەیە کە خودی بەڵگەکە ئاشکرا و دیار بێت و ببێتە بەڵگە بۆ شتێکی تر، گەر وانەبوو ئەوا خۆی پێویستی بە بەڵگەیە، جا ئەگەر بەڵگەیەکی تر ئەوەی نیشاندا کە ئەم بەڵگەیە ڕاست نیە، ئەوا حەق وایە هەر پێی نەووترێ بەڵگە.

**(الإعتصام - بەرگی 1 - لاپەڕە 320)**

**الشوكاني دەڵێ:** شتێک کە چەند ئەگەرێک لەخۆ دەگرێت نابێتە بەڵگە لەسەر کەسی موخالیف. **(نيل الأوطار - بەرگی 1 - لاپەڕە 62)**

**وە هەروەها دەڵێ:** واقیعی حاڵەکان ئەگەر چەند ئەگەرێکی لەخۆ گرت ئەوا بەڵگە پێ هێنانەوەی لە دەست دەدات بەهۆی ئەو موجمەلیەی کە تیایدا ماوە.

**(نيل الأوطار - بەرگی 2 - لاپەڕە 59)**

**له کۆتاییدا دەڵێم:**

تەحەددای هەموو ئەوانە دەکەم کە عوزر بە جەهل دەهێننەوە لە تەوحید دا کە بتوانن ووتەی زانایەکی سەلەف بهێننەوە تاوەکو دەگاتە سەردەمی شێخ محمد و نەوەکانی کە بڵێن: ئەم ووتەیەی هاوەڵان شیرکی گەورە بوو بەڵام لەبەر ئەوەی تازە موسڵمان ببوون تەکفیر نەکران.

دڵنیام هیچیان بە دەستەوە نیە جگە لە ووتەی کۆمەڵێک زانای ئەم سەردەمە کە تەکفیر بە شتێکی زۆر خراپ و ناشرین دەبینن و عوزر بۆ هەموو طاغوتێک دەهێننەوە لە کوفرەکانیدا ئینجا چۆن عوزر بۆ کەسێکی جاهیل ناهێننەوە.

وە ئەگەر دەڵێن جگە لەم فەرموودەیەش فەرموودەی ئەو پیاوەی ووتی بم سوتێنن دوای مردنم بەڵگەیە بۆ عوزر بە جەهل لە تەوحید دا، وە ئەثەرەکەی (ابن عباس) رضي الله عنه (كفر دون كفر) بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسەی کوفر دەکات کافر نابێت تاوەکو کوفرەکە بە حەڵاڵ بزانێت ئینجا کافر دەبێت، ئەوا دەڵێین: گومانەکانی سەر هەردووکیان وەڵام دراوەتەوە لەلایەن زانایان، بەم شێوەیە نیە کە ئێوە بەڵگەی پێ دەهێننەوە. والله أعلى وأعلم.

**وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**
**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**